بەشێک لە پەیامەکانی نوور



# نوورەکانی حەقیقەت

## چەند باسێکە لە تەسەووف و سلووکدا




بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق رەسوول یەحیا

کردوویە بە کوردی

گولبژێرێك لە پەیامەكانی نوور

# نوورەكانی حەقیقەت

چەند باسێكە لە "تەسەووف" و "سلووك"دا

بەدیعوززەمان
سەعیدی نوورسی
دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا
كردوویە بە كوردی

تێبینی یەك:

ئـەم کتێبـەی بەردەسـتی خوێنـەری بەڕێز، لە چەند نامیلکە و وردە باسێکی "پەیامـەکانی نـوور" پێکـهاتووە، کـە سـەرجەمیان لـە نـاوەڕۆکی بابەتـەکانی "تەزکیـە" و "تەسـەووف" و "سـەیر و سلووك"دەدوێن و، مامۆستا نوورسی بۆ خۆی لەو پەیامانە هەڵی بژاردوون و، بەم شێوەیە بڵاوی کردوونەتەوە. (وەرگێڕ)

بنچینەی چوارەمی وتەی دوازدەهەم:

## بەرزیی قورئان

**ئەگەر دەتەوێت تێبگەیت لەوەی کە چۆن قورئانی پیرۆز بەسەر هەموو وتە و فەرمایشتەکانی تری خوای گەورە و هەموو گوفتارێکدا بلندترە و، دەتەوێت بزانیت چۆن لە هەموو وتەیەك بەرزترە، ئەوا بە وردی سەرنجی ئەم دوو نموونەیەی خوارەوە بدە:**

❒ نموونەی یەکەم:

پادشا دوو جۆر گوفتار و فەرمایشتی هەیە:

یەکەمیان: گوفتارێکی تایبەتی‌یە، کە بەهۆی تەلەفۆنێکی تایبەتی‌یەوە لەگەڵ یەکێك لە هاوولاتییاندا سەبارەت بە کارێکی هەندەکی و ئیشێکی تایبەتیی خۆیەوە، دەیکات.

ئەوی تریان: قسەکردنە بە ناوی پادشایەتیی پڕ شکۆی خۆی و بە ناونیشانی خەلافەتی گەورە و بە چۆنێتیی فەرمانڕەوایی گشتی و بە مەبەستی بلاو کردنەوەی فەرمانە پادشاییەکانی لە هەموو لایەکدا. واتە ئەم یەکەیان گوفتارێکە لەگەڵ کەسێك لە نێرراوانی خۆی، یان یەکێك لە فەرمانبەرە گەورەکانیدا. کەواتە ئەم گوفتارە سەبارەت بە شتێکی گەورەیە و، پەیوەندیشی بە هەموانەوەیە.

❒ نموونەی دووهەم:

پیاوێك ئاوێنەیەکی بە دەستەوەیە و ڕووەو "خۆر" ڕایگرتووە. دیارە ئاوێنەکە بە ئەندازەی گەورە و بچووکیی خۆی ڕووناکی‌یەك وەردەگرێت کە هەر حەوت ڕەنگەکانی شەبەنگی خۆری تێدایە. کەواتە ئەم پیاوە بەپێی

ئه‌ندازه‌ی ئه‌و ئاوێنه‌یه سوود له خۆر وه‌رده‌گرێت، وه‌ك ئه‌وه‌ی ڕووناكیی ئاوێنه‌كه‌ی ئاراسته‌ی ژووره تاریكه‌كه‌ی یاخود "شه‌تڵگا" تایبه‌تی و بچووكه سه‌رگیراوه‌كه‌ی خۆی بكات. ئه‌وه‌نده هه‌یه ئه‌و سووده‌ی كه له خۆره‌وه وه‌ری ده‌گرێت سوودێكی كه‌مه، چونكه ته‌نها به‌پێی توانای ئاوێنه‌كه‌ی سوود له ڕووناكیی خۆر وه‌رده‌گرێت، نه‌ك به ئه‌ندازه‌ی گه‌وره‌یی خۆر.

له هه‌مان كاتدا پیاوێكی تر واز له ئاوێنه ده‌هێنێت و، ڕاسته‌وخۆ ڕوو ده‌كاته خۆر و سه‌یری شێوه و گه‌وره‌یی خۆر ده‌كات، ئنجا ده‌ڕواته سه‌ر چیایه‌كی به‌رز و بڵند و سه‌یری دره‌وشانه‌وه‌ی ده‌سته‌ڵاتداریی فراوان و شكۆمه‌ندیی خۆر ده‌كات و، بێ په‌رده ڕوو به ڕووی ڕاده‌وه‌ستێت. پاشان ده‌گه‌ڕێته‌وه له خانووه بچووك و "شه‌تڵگا" سه‌رگیراوه تایبه‌تی‌یه‌كه‌ی خۆیدا چه‌ند كلاوڕۆژنه‌یه‌كی فراوان ڕووه‌و خۆر ده‌كاته‌وه و، به‌م پێیه ڕێگایه‌ك ده‌دۆزێته‌وه بۆ سوودوه‌رگرتن له‌و خۆره‌ی كه له‌و جێگا به‌رز و بڵنده‌ی ئاسماندایه. ئنجا ئه‌م پیاوه له‌گه‌ڵ خۆر و ڕووناكی‌یه‌كه‌یدا – به زمانی حاڵ – ئه‌م وتووێژه سوپاسگوزارییانه‌یه ده‌كات:

(ئه‌ی ئه‌و خۆره‌ی كه له‌سه‌ر ته‌ختی جوانیی جیهاندا دانیشتوویت! ئه‌ی گوڵی گه‌شاوه‌ی ڕووی ئاسمان! ئه‌ی ئه‌و خۆره‌ی كه جوانی و ڕووناكیت به زه‌وی و، خه‌نده و شادیت به گوڵان به‌خشیوه! هه‌روه‌ك گه‌رمی و ڕووناكیت به گشت لایه‌كی جیهاندا بڵاو كردووه‌ته‌وه، ماڵ و شه‌تڵگا بچووكه‌كه‌ی منیشت به‌سه‌ر كردووه و له گه‌رمی و ڕووناكیی خۆت پێ به‌خشیون).

ئه‌م پیاوه ده‌توانێت، به زمانی حاڵ، ئه‌م چه‌شنه گفتوگۆیه له‌گه‌ڵ خۆردا بكات. به‌ڵام خاوه‌نی ئاوێنه‌كه ناتوانێت به‌م شێوازه ئه‌م گفتوگۆیه‌ی له‌گه‌ڵدا بكات، چونكه شوێنه‌واری ڕووناكیی خۆر به‌پێی سنووری ئاوێنه‌كه‌ی ده‌بێت و به ئه‌ندازه‌ی توانای ئه‌و ئاوێنه‌یه ڕووناكیی ده‌ست ده‌كه‌وێت.

ئنجا – دوای ئەمە – وەرە لە ڕوانگەی ئەم دوو نموونەیەوە تەماشای قورئانی پیرۆز بکە، با هەست بە ئیعجازە بڵند و پایەدارەکەی بکەیت.

بەڵێ، قورئانی پیرۆز دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ أَنَّ ما في الأَرضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقلامٌ والْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ ما نَفِدَتْ كلِماتُ اللهِ إنَّ اللهَ عزيزٌ حَكيمٌ﴾ (لقمان:٢٧).

بەخشینی پلەی هەرە بەرز بە قورئانی پیرۆز لە نێوان هەموو وتە لە سنوور بەدەرەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە قورئانی پیرۆز لە عەرشی ئەعزەم و، لە ئیسمی ئەعزەم و، لە پلەی هەرە گەورەی هەموو یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورەوە، نازڵ بووە.

کەواتە قورئانی پیرۆز بریتی‌یە لە:

"فەرمانی خوای گەورە" بەو سیفەتەی کە خوای گەورە "خوای هەموو بوونەوەرانە"و..

"فەرمایشتی ئەو" بەو سیفەتەی کە "بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکانە" و..

"فەرموودەی بەرزی ئەو" بەو سیفەتەی کە پەروەردگاری ڕەهایە لە بوونەوەردا و..

"فەرمایشتی ئەزەلیی ئەو" کە بە ناوی پادشایەتی و دەستەڵاتداریی هەمەلایەنە و مەزنەوە فەرموویەتی و..

"تۆماری ڕێزلێنانی خواوەندی میهرەبان"ە کە لەو بەزەییە فراوانەوە هەڵقوڵاوە کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە و..

"کۆمەڵە نامەیەکی پەروەردگارییانە"ی ئەوتۆیە کە مەزنیی خوایەتیی ئەو ڕوون دەکەنەوە، چونکە لە سەرەتای هەندێ لەم نامانەدا چەند هێما و پەرلە(شفرة)یەك بەکار هێنراوە کە ئەمە دەگەیەنن و..

هه‌روه‌ها ئه‌و كتێبه‌ پیرۆزه‌یه‌ كه‌ دانایی لـێ ده‌بارێت.

له‌به‌ر ئه‌م هه‌موو نهێنییانه‌یه‌ كه‌ ناوێكی شایانی خۆی لـێ نراوه‌، ئه‌وه‌تا پێی ده‌وترێت: "كلام الله" واته‌: گوفتار و فه‌رمایشتی خوا!

بـه‌ڵام فـه‌رمـووده‌كانی تـری خـواوه‌ند به‌شـێكیان بـه‌ بایـه‌خ پێدانێكـی تایبه‌تی و، به‌ ناونیشانێكی هه‌نده‌كی و، دره‌وشانه‌وه‌یه‌كی هـه‌نده‌كیی نـاوێكی تایبـه‌تی و، په‌روه‌ردگارێتی‌یـه‌كی تایبـه‌تی و، ده‌سـته‌ڵاتێكی تایبـه‌تی و میهره‌بانی‌یه‌كی تایبه‌تی‌یه‌وه‌، هه‌ڵقوڵاون.

كه‌واتـه‌ بـه‌پێی "تایبـه‌تی" و "هـه‌نده‌كێتی"ی ئـه‌م فه‌رموودانـه‌، پلـه‌كانیان جیـاواز ده‌بن. زۆربـه‌ی ئیلهامـه‌كان لـه‌م به‌شـه‌ن، بـه‌ڵام لـه‌ نێـوان خۆیـاندا پله‌كانیان تابڵێی جیاجیایه‌.

بۆ نموونه‌:

ئاسایی‌ترین و هه‌نده‌كی‌ترینی ئیلهامه‌كان هی ئاژه‌ڵ و زینده‌وه‌رانه‌، پاشان هی خـه‌ڵكی عـه‌وام، ئنجـا هـی زۆربـه‌ی مه‌لائیكه‌تـه‌كان، ئنجـا ئیلـهامی ئه‌ولیاكان، پاشان ئیلهامی گه‌وره‌ مه‌لائیكه‌تانی خواوه‌نده‌.

له‌م نهێنی‌یه‌وه‌یه‌ كه‌ هه‌ندێ جار له‌ وه‌لی‌یه‌ك ده‌بیستیت ده‌ڵێت: "حدثـــني قلبي عن ربي". واته‌: (دڵم له‌ خوای په‌روه‌ردگارمه‌وه‌ بـۆی گێڕامـه‌وه‌ ) واتـه‌ به‌و ته‌له‌فۆنه‌ی كه‌ له‌ دڵیدا هه‌یه‌، به‌ بێ بوونی هیچ هۆكارێك له‌ مه‌لائیكه‌تان. كه‌چی لێی نابیستیت بڵێت: "په‌روه‌ردگاری جیهانیان بـۆی گێڕامـه‌وه‌". یـان ده‌ڵێـت: "دڵـم عـه‌رش و ئاوێنه‌یه‌كـه‌ بـۆ دره‌وشـانه‌وه‌كانی پـه‌روه‌ردگارم"، كـه‌چی نـاڵێت: "عـه‌رشی پـه‌روه‌ردگاری جیهـانیـان". چونكـه‌ بـه‌پێی لێهاتوویی و توانـای خۆی و بـه‌ هه‌ڵدانـه‌وه‌ی نزیكـه‌ی حـه‌فتا هـه‌زار پـه‌رده‌، ده‌توانێت به‌شێكی له‌ گوفتارێكی په‌روه‌ردگاری خۆی ده‌ست بكه‌وێت.

بەڵێ، بە ئەندازەی بەرزیی گوفتارێکی پادشا کە لە ڕوانگەی پادشایەتی‌یەکەیەوە کردبێتی، بەسەر گوفتارێکی تری خۆی کە لەگەڵ یەکێك لە هاووڵاتییانیدا دەیکات و.. بە گوێرەی زۆریی ئەو سوودەی کە ڕاستەوخۆ لە ڕووناکیی خۆری ناوجەرگەی ئاسمان وەردەگیرێت، لە چاو ئەو ڕووناکی‌یەی کە لە ئاوێنەکەدا درەوشایەوە.. بەم ئەندازەیە، دەتوانین تێبگەین لە: بەرزیی قورئان بەسەر هەموو گوفتار و فەرموودەکانی تری خواوەند و کتێبە ئاسمانی‌یەکانی تردا.

کەواتە هەموو کتێب و صوحوفە ئاسمانی‌یەکان لە دوای قورئانەوە دێن و، لە پلەی دووهەمدان و، هەریەکەیان پلە و پایەی بڵندی خۆی هەیە و، بەشێکی لەو نهێنی و بەرزی‌یە تێدایە.

خۆ ئەگەر هەرچی وتەی ڕێکوپێك و جوانی بەرەی جیننی و ئادەمیزاد هەن - کە لە قورئان وەرنەگیرابن - کۆ ببنەوە، ئەوا هەرگیز ناتوانن نزیکی ئەو پلەیە ببنەوە و بگەنە ئەو ئاستەی کە ببن بە هاوچەشنی قورئانی پیرۆز.

جا ئەگەر دەتەوێت شتێك تێبگەیت لەوەی کە قورئانی پیرۆز لە "ئیسمی ئەعزەم" و لە پلەی هەرە گەورەی هەموو یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورەوە نازڵ بووە، ئەوا سەرنجی "آيــة الكرســي" و ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوە بدە و، بە وردی بیر لە واتا گشتی و بەرزەکانیان بکەرەوە:

﴿وعِنْدَهُ مَفاتِحُ الغَيب﴾ (الأنعام:٥٩).

﴿قُلِ اللّهُمَّ مالِكَ المُلْكِ﴾ (آل عمران:٢٦).

﴿يُغْشي اللَّيْلَ النَّهارَ يَطْلُبُهُ حثيثاً والشمسَ والقَمَرَ والنُّجُـومَ مســخَّراتٍ بِأَمْرِهِ﴾(الأعراف:٥٤).

﴿يا أَرضُ ابلعي ماءَكِ ويا سماءُ أَقلعي﴾ (هود:٤٤).

﴿تُسَبِّحُ له السموات السَّبْعُ والأَرضُ ومَن فيهن﴾ (الإسراء:٤٤).

﴿ما خَلْقُكُمْ ولا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ واحدة﴾ (لقمان:٢٨).

﴿إنّا عَرَضْنا الأَمانَةَ على السَّموات والأَرضِ والجِبالِ﴾ (الأحزاب:٧٢).

﴿يومَ نطوي السَّماءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ للكُتُبِ﴾ (الأنبياء:١٠٤).

﴿وما قدروا الله حق قدره والأَرضُ جـميعاً قبضَتُهُ يومَ القيامة﴾ (الزمر:٦٧).

﴿لو أَنْزَلْنا هذا القرآنَ على جبلٍ لرأيتَهُ...﴾ (الحشر:٢١).

هه‌روه‌ها ئایه‌ته‌كانی تری هاوچه‌شنیان.

پاشان به‌ وردی سه‌رنج له‌و سووره‌تانه‌ بده‌ كه‌ به‌: ﴿الحمد لله﴾ و ﴿تسبح ...﴾ ده‌ست پێ ده‌كه‌ن، تاكو تیشكی ئه‌م نهێنی‌یه‌ گه‌وره‌یه‌ ببینیت. پاشان سه‌یری ئه‌و سووره‌تانه‌ بكه‌ كه‌ به‌: ﴿الم﴾ و ﴿الر﴾ و ﴿حم﴾ ده‌ست پێ ده‌كه‌ن، تاكو تێبگه‌یت له‌ ڕاده‌ی گرنكیی قورئان له‌ لای خوای گه‌وره‌ی په‌روه‌ردگاری جیهانیان.

جا ئه‌گه‌ر له‌م نهێنی‌یه‌ ورده‌ی ئه‌م بنچینه‌ی چواره‌مه‌ تێگه‌یشتیت، ئه‌وا ده‌توانیت له‌و نهێنی‌یه‌ش تێبگه‌یت كه‌ زۆربه‌ی ئه‌و "وه‌حی"یانه‌ی بۆ پێغه‌مبه‌ران – درووديان له‌سه‌ر بێت – نازڵ بوون، به‌هۆی مه‌لائیكه‌ته‌وه‌ بووه‌، به‌ڵام "ئیلهام" به‌ بێ هیچ هۆكارێك ڕوو ده‌دات..

هه‌روه‌ها له‌ نهێنیی ئه‌وه‌ش تێده‌گه‌یت كه‌ گه‌وره‌ترین "وه‌لی" ناگاته‌ ئاستی هیچ كام له‌ "پێغه‌مبه‌ران" درووديان له‌سه‌ر بێت..

هه‌روه‌ها له‌ مه‌زنی و پیرۆزیی قورئان و پایه‌داریی ئیعجازه‌كه‌ی تێده‌گه‌یت..

هەروەها تێدەگەیت لە نهێنی و حیکمەتی پێویستیی "میعراج". واتە: تێدەگەیت لە نهێنیی ڕۆشتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئاسمانە بەرزەکان و "سدرة المنتهی" و، "قاب قوسین أو أدنی" و، گفتوگۆ کردنی لەگەڵ خواوەندا، هەرچەندەش خوای گەورە لە ڕەگی لامل لێیەوە نزیکترە و، پاشان گەڕانەوەی بۆ جێی خۆی لە ماوەی چاوتروو کاندنێکدا.

بەڵێ، هەروەك "لەتکردنی مانگ" موعجیزەیەکە بۆ چەسپاندن و ڕوونکردنەوەی پێغەمبەرێتیی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بۆ گرۆی جیننی و ئادەمیزاد.. "میعراج"یش موعجیزەی بەندایەتیی پێغەمبەرە ﷺ بۆ خواوەند و، خۆشەویستیی ئەوی لای خوای گەورە بۆ ڕۆحانییات و مەلائیکەتان دەرخست.

اللهم صل وسلم عليه وعلى آله كما يليق برحمتك وبحرمته. آمين.

بریسکەی سێهەم:

## یا باقي أنت الباقي

**شتێك لە: "چێژ و هەست و نەستەکان" ناوێتەی ئەم بریسکەیە بووە. بۆیە تکام وایە بە پێوەرەکانی زانستی "مەنتیق" هەڵنەسەنگێنرێت، چونکە جۆش و خرۆشی هەست و نەستەکان ناور لە تەرازووەکانی "بیر" نادەنەوە و، زۆر گوێش بە دەستوورەکانی "ژیری" نادەن!**

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿كُلُّ شيءٍ هالِكٌ إلاّ وجْهَهُ لهُ الْحُكْمُ وَإليهِ تُرجَعُونَ﴾ (القصص:٨٨)

دوو ڕستە هەن کە دوو حەقیقەتی گرنگ دەردەبڕن و تەفسیری ئەم ئایەتە مەزنە دەکەن، بە ڕادەیەك کە هەندێ لە شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی کردوویانن بە پوختەی ویردەکانیان و خەتمەی تایبەتیی خۆیانی پێ ئەنجام دەدەن. ئەو دوو ڕستەیەش بریتین لە:

"یا باقي أنت الباقي.. یا باقي أنت الباقي"!

جا لەبەر ئەوەی ئەم دوو ڕستەیە گەلێ واتای مەزنی ئەم ئایەتەیان تێدایە، ئەوا چەند سەرنجێك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو دوو حەقیقەتە باس دەکەین کە ئەم دوو ڕستەیە دەریاندەبڕن.

✿ **سەرنجی یەکەم:**

وتنی یەکەم جاری: "یا باقي أنت الباقي" دڵی مرۆڤ لە غەیری خوای گەورە دادەبڕێت و، جۆرە نەشتەرگەرییەك لە دڵدا ئەنجام دەدات و، لە غەیری خوا دایدەماڵێت.

ڕوونکردنەوەی ئەمەش بەم جۆرەیە:

لەبەر ئەوەی مرۆڤ چی‌یەتی(ماهیة)یەکی گشتیی تێدا دانراوە، ئەوا لە چەندین ڕێگاوە و بە چەندەها جۆر پەیوەندیی لەگەڵ زۆربەی بوونەوەراندا هەیە. جا ئەو چی‌یەتی‌یە گشتی‌یەی مرۆڤ هێندە توانا و لێهاتنی خۆشەویستیی تێدایە کە لە ناخەوە سەرانسەری بوونەوەرانی بە گەرمی و توندوتیژی خۆش بوێت! ئەوەتا هەروەك خانە و لانەکەی خۆی خۆش دەوێت، ئەم دنیا مەزنەشی خۆش دەوێت.. هەروەها وەك دڵی بە باخچەکەی خۆی خۆشە، بە هەمان جۆر دڵی بە "بەهەشتی بەرین"یش دەکرێتەوە و لە ناخەوە ئارەزوومەندیەتی..

بەڵام خۆ ئەو بوونەوەرانەی کە مرۆڤ لەم دنیایەدا خۆشەویستیی خۆی بۆ ئاراستە کردوون هیچیان نامێننەوە، بەڵکو تێکڕا لەسەر ڕێی گەشتی نەماندا بە خێرایی و بەردەوامی دەڕۆن و هەنگاو دەنێن! بۆیە مرۆڤ هەمیشە ئازاری جودایی دەچێژێت و، خۆشەویستی‌یە لەبن نەهاتووەکەشی بۆ دەبێت بە مایەی ئازارێکی مەعنەویی بێ کۆتایی، لە ئەنجامی قوسوور و کەمتەرخەمی‌یەوە بەرامبەر بەو خۆشەویستی‌یە نەبڕاوەیەی کە لە ناخیدا دانراوە.

کەواتە ئەو ئازارانەی کە بەدەست ئەو خۆشەویستی‌یەوە دەیانچێژێت هی کەمتەرخەمی کردنی خۆیەتی لە بەجێهێنانی ئەرکەکانی ئەو خۆشەویستی‌یەدا. چونکە توانا و لێهاتنی خۆشەویستیی بۆ ئەوە دراوەتێ ئاراستەی ئەو کەسەیان بکات کە خاوەنی جوانیی هەتاهەتایی و ڕەهایە. کەچی مرۆڤ بە باشی و لە جێی شیاوی خۆیدا بەکاری نەهێنا و بەرەو بوونەوەرە فانی و لەناوچووەکان ئاراستەی کرد، بۆیە بە ئازاری جودایی و لێکدابڕانی لەو خۆشەویستە فانییانەی گیرۆدە دەکرێت و سزا دەدرێت!

جا كاتێ كه مرۆڤ "يا باقي أنت الباقي" دەڵێتەوە، بۆ ئەوەیە كه بە تەواوی لەو كەمتەرخەمییانە دەستبەردار ببێت و بە یەكجارەكی پەیوەندییەكانی بەو خۆشەویستە فانییانەوە بپچڕێت، پێش ئەوەی كه ئەوان دەست لەم دابشۆن و پشتی لێ هەڵبكەن!

پاشان دووپات كردنەوەی ئەم ڕستەیە بۆ ئاراستە كردنی بیر و ڕوانینی مرۆڤە تەنها ڕووەو خۆشەویستی باقی و هەمیشەیی كه خوای گەورەیە.

واتە مرۆڤ لە ڕێی دووپات كردنەوەی ئەم ڕستەیەوە، دەڵێ:

(ئەی خوای گەورەم! جگە لە تۆ كەسی تر بە ڕاستی و دروستی نامێنێتەوە. هەرچی شتی تری غەیری تۆ هەیە هەر هەموویان فانی و لەناوچوون. خۆ ئاشكراشە كه شتی فانی و لەناوچوو شایانی خۆشویستنی بەردەوام و عیشقی هەمیشەیی نییە و، هێندە ناهێنێت ئەو دڵەی پێوە پەیوەست بكرێت كه هەر لە سەرەتاوە بۆ هەمیشەیی و مانەوە و نەمری بەدی هێنراوە. جا مادەم بوونەوەرە فانییەكان من بەجێ دەهێڵن و بە ڕێی خۆیاندا دەڕۆن، ئەوا پێش ئەوەی بەجێم بهێڵن من دەست لەوان بەردەدەم و وازیان لێ دەهێنم و، دەڵێم: "يا باقي أنت الباقي"..

واتە بەوپەڕی دڵنیاییەوە لەو باوەڕ و یەقینەدام كه جگە لە تۆ - ئەی خوای گەورەم! - كەسی تر "باقی" نییە و، هەر شتێكیش لە بوونەوەراندا دارای "مانەوە" بێت هەرتۆ مانەوەت پێ بەخشیوە و هێشتووتەتەوە. كەواتە دەبێ مرۆڤ تەنها لە ناوەندی خۆشویستنی تۆ و لە بازنەی ڕەزامەندیی تۆدا ئەوانەی خۆش بوێت، دەنا هیچیان شایستەی ئەوە نین كه دڵیان پێوە پەیوەست بكرێت)!

ئەم چەشنە حاڵەتە، كارێك دەكات كه "دڵ"ی مرۆڤ واز لەو خۆشەویستانەی بهێنێت كه لەوەوپێش بە جۆرێكی بێ سنوور خۆشی

دەویستن. چونکە لەم جۆرە حاڵەتانەدا مرۆڤ مۆری فەنا و نەمان بەسەر رووی هەموو ئەو شتانەوە دەبینێت کە زووتر جوانیی تێدا دەبینین و، هەموو ئەو پەیوەندییانەش دەبچڕێن کە لەوەوپێش مرۆڤیان پابەندی بوونەوەران کردبوو. دەنا گەر دڵی مرۆڤ واز لەو خۆشەویستانەی نەهێنێت، ئەوا بە ئەندازەی ئەوان زام و ئازاری خەم و حەسرەت لە ناخی دڵیدا پەیدا دەبن و سەرهەڵدەدەن!

ڕستەی دووهەمی: "یا باقی أنت الباقی"ش وەك مەڵهەمێکی شیفابەخش و ساڕێژکار وایە بەسەر زامی ئەو نەشتەرگەرییەدا دەهێنرێت کە ڕستەی یەکەم لە "دڵ" و پەیوەندییەکانیدا کردی. چونکە ئەم ڕستەی دووهەمە ئەوە دەگەیەنێت کە:

(ئەی خوای گەورە! هەر تۆم بەسە باقی بێت، چونکە مانەوەی تۆ لە بریی مانەوەی هەموو شتێکی ترە.. مادەم تۆ هەیت، ئەوا هەموو شتێکی ترم هەیە)!

بەڵێ، هەرچی "جوانی و چاکە و کەماڵ" بەسەر ڕوخساری بوونەوەرانەوە دەبینرێن و مایەی خۆشویستنی ئەو بوونەوەرانەن، لە ڕاستیدا، چەند ئاماژەیەکن بۆ "جوانی و، چاکە و، کەماڵ"ی خواوەند کە باقیی ڕاستەقینەیە و، تێکڕا چەند سێبەرێکی کزی ئەو جوانی و چاکە و کەماڵەن کە لە پشتی چەندەها پەردەی زۆر و زەبەندەوە دەرکەوتوون، تەنانەت چەند سایە و سێبەرێکن بۆ سێبەرەکانی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە!

### ✿ سەرنجی دووهەم:

عیشقێکی توندوتیژ بۆ "مانەوە" لە سروشتی مرۆڤدا هەیە. تەنانەت - بە گومانی خۆی - جۆرە مانەوەیەك لە هەموو خۆشەویستەکانیدا دەبینێت. بگرە هیچ شتێکی خۆش ناوێت گەر - بە وەهمی خۆی - "مانەوە"ی تێدا

نه‌بینێت! به‌ڵام هه‌ر كه بیر له نه‌مانی ئه‌و شتانه ده‌كاته‌وه و فه‌نا و تیاچوونیان ده‌بینێت، له قووڵایی ناخی خۆیه‌وه گرفتاری خه‌م و په‌ژاره ده‌بێت و ئاخ و حه‌سره‌تی گه‌رمیان بۆ هه‌ڵده‌ڕێژێت!

به‌ڵێ، هه‌رچی ئاخ و حه‌سره‌ت و په‌ژاره‌ی جۆره‌كانی "جودایی" هه‌ن، هه‌ر هه‌موویان چه‌ند ده‌سته‌واژه و داخ هه‌ڵڕشتنێكی خه‌مناكن كه له "عیشقی مانه‌وه"ی ناو ناخی مرۆڤه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرن. چونكه گه‌ر وه‌همی مانه‌وه نه‌بوایه هه‌رگیز مرۆڤ هیچ شتێكی نه‌ده‌ویست. ته‌نانه‌ت ده‌توانرێت بوترێ كه:

یه‌كێك له هۆكاره‌كانی بوونی "جیهانی مانه‌وه و به‌هه‌شتی هه‌میشه‌یی" ئه‌و ئاره‌زووه به‌تینه ڕه‌گداكوتاوه‌ی ناو ناخی سروشتی مرۆڤه بۆ "مانه‌وه"و "هه‌تاهه‌تایی" و، ئه‌و نزا و لالانه‌وه گشتی و هه‌مه لایه‌نه‌شیه‌تی كه به كه‌فوكوڵ و گه‌رموگوڕی بۆ "مانه‌وه" ده‌یكات! بۆیه خواوه‌ندی شكۆمه‌ندی "باقی" به‌ده‌م ئه‌و ئاره‌زووه توندوتیژه‌ی مرۆڤه‌وه ڕۆشت و دوعا و نزای كاریگه‌ر و به‌كوڵی لێ گیرا كرد و، جیهانێكی "باقی"ی بۆ ئه‌م مرۆڤه "فانی"یه به‌دی هێنا. چونكه ئایا ده‌گونجێ به‌دیهێنه‌ری به‌خشنده و میهره‌بان ئه‌و دوعا و نزا گشتی و به‌رده‌وام و ڕه‌وا و خاوێنه گیرا نه‌كات كه گرۆی مرۆڤ - به زمانی حاڵ و گوفتار - له ناخی پێویستیی سروشتیی خۆی و له قووڵایی حه‌ز و ئاره‌زووه به‌تینه‌كانیه‌وه ده‌یكات، له كاتێكدا كه هه‌ر ئه‌و خواوه‌نده به‌خشنده و میهره‌بانه دوعای زمانی حاڵی گه‌ده(معدة)ی بچووكی مرۆڤ گیرا ده‌كات و چه‌نده‌ها جۆر خوارده‌مه‌نیی به‌تام و له‌زه‌تی بۆ به‌دی ده‌هێنێت و ئاره‌زووی جوزئیی مرۆڤ بۆ "مانه‌وه"ی كاتی ده‌لاوێنێ؟!

دیاره نه‌خێر.. هه‌زار هه‌زار جار نه‌خێر! گه‌لێ مه‌حاڵه ده‌ست به ڕووی ئه‌م نزا و لالانه‌وه‌یه‌ی مرۆڤه‌وه بنێت كه داوای "مانه‌وه"ی پێ ده‌كات.

چونکه گیرا نەکردنی نزا و لاڵانەوەی ئاوا، پێچەوانەی دانستی هەمیشەیی و، دادگەریی کامڵ و، میهرەبانیی فراوان و، توانستی ڕەهای خوای گەورەیە!

جا مادەم مرۆڤ شەیدا و تاسەمەندی "مانەوە"یە، ئەوا سەرجەم چێژ و کەماڵاتیشی - بە هەمان جۆر - شوێنکەوتەی "مانەوە"ن..

ئنجا مادەم "مانەوە"ش سیفەتێکی تایبەتە بە خواوەندی "باقی"ی شکۆمەند و..

مادەم ناوە جوانەکانی ئەو خوایەش تێکرا "باقی"ن و دارای مانەوەن و، ئاوێنە دەرخەرەکانی درەوشانەوەکانی ئەو ناوانەش ڕەنگی درەوشانەوەی ناوەکان دەگرن و لە حوکمی ئەودا دەبن، واتە جۆرە "مانەوە"یەك بەدەست دەهێنن..

ئەوا پێویستترین و مەزنترین ئەرکێك کە دەکەوێتە ئەستۆی مرۆڤ، بریتی‌یە لەوەی کە:

پەیوەندی‌یەکانی لەگەڵ ئەو "باقی"یە شکۆمەندەدا پتەو بکات و، بە تەواوەتی دەست بە ناوە جوانەکانیەوە بگرێت. چونکە هەر شتێك لە پێناوی ئەو "باقی"یەدا بەخت بکرێت، جۆرێك لە جۆرەکانی "مانەوە"ی دەست دەکەوێت!

جا ئەم حەقیقەتە ڕستەی دووهەمی "یا باقي أنت الباقي" دەری دەبڕێت و، زامە مەعنەوی‌یە قوولەکانی مرۆڤ سارێژ دەکات. هەروەك دڵنیاییش بەو حەز و ئارەزووە بەتینەی "مانەوە"ی ناو ناخی سروشتی دەبەخشێت!

✿ **سەرنجی سێهەم:**

لەم دنیایەدا کاریگەریی "کات" بۆ لەناوبردنی شتان جیاوازە و، لە شتێکەوە بۆ شتێکی تر دەگۆڕێت. چونکە هەرچەندە بوونەوەران بە چەشنی

بازنـــه هاوچه‌قـــه‌كان لـــه‌ناو يـــه‌كتريدان، كـــه‌چى لـــه ڕووى نـــه‌مان و له‌ناوچوونيانه‌وه حوكميان جياوازه..

ئه‌وه‌تا هه‌روه‌ك بازنه‌ى جووڵه‌ى ميله‌كانى: چركه ژمێر و خولـه‌ك ژمێر و كاتژمێرى هه‌ر سه‌عاتێك - له ڕووى خێراييه‌وه - لـه يه‌كتر جيـاوازن، بـا لـه ڕواڵه‌تيشدا له يه‌ك بچـن.. مرۆڤيش به هـه‌مان جـۆره؛ حوكمـى "زه‌مـان" بـۆ هه‌ريه‌كه لـه بازنـه‌كانى: جه‌سته و، ده‌روون و، دڵ و، ڕۆحـى ئـه‌و جيـاوازه. چونكه له كاتێكدا كه ده‌بينيت ژيان و مانه‌وه‌ى "جه‌سـته"ى مـرۆڤ پابـه‌ندى مانه‌وه‌ى ئه‌و ڕۆژه يان ئه‌و سه‌عاته‌يه كـه تيـايدا ده‌ژى و، ڕابـوردوو و ئاينده‌ى نى‌يه.. كه‌چى ده‌بينيت بازنه و مـه‌يدانى بـوون و ژيـانى "دڵ"ى هێنـده فراوانـه كه چه‌نده‌ها ڕۆژى پێش ئێسـتا و دواى ئێسـتاش ده‌گرێتـه‌وه! ته‌نانـه‌ت بازنـه و مـه‌يدانى ژيـانى "ڕۆح"ى مـرۆڤ لـه‌وه‌ش گه‌لـێ گـه‌وره و مـه‌زنتره، چونكـه چـه‌نده‌ها سـاڵى پێـش ئـه‌مڕۆ و چـه‌نده‌ها سـاڵى دواى ئـه‌مڕۆش لـه خـۆى ده‌گرێت.

جا لـه‌سه‌ر بناغه‌ى ئـه‌م توانـا و لێهاتنـه: گـه‌ر "دڵ" و "ڕۆح"ى مـرۆڤ بـه: ناسين و په‌رستنى خـواى گـه‌وره و، خۆشويستنى پـه‌روه‌ردگار و به‌ده‌ستهێنانى ڕه‌زامه‌ندى‌يه‌كانى، ژيانيان به‌ده‌ست هێنابێت، ئـه‌وا - لـه‌م ڕێ‌يـه‌وه - ته‌مه‌نـه فانى‌يه‌كـه‌ى "جه‌سته" ته‌مـه‌نێكى هه‌ميشـه‌يى لـه ئـامێز ده‌گرێـت، ته‌نانـه‌ت لـه خانـه‌ى نـه‌مرى و هه‌ميشـه‌ييدا ئـه‌م ته‌مه‌نـه "بـاقى" و نه‌بڕاوه‌يـه‌ى بـۆ به‌رهـه‌م ده‌هێنێت. كه‌واته ئه‌م ته‌مه‌نه "فانى"يه وه‌ك ته‌مه‌نێكى "باقى" و هه‌ميشـه‌يى لـێ دێت!

به‌ڵێ، به‌سـه‌ربردنى ته‌نـها يـه‌ك چركـه لـه پێنـاوى: خـواوه‌نـدى حـه‌ق و "باقى"دا و، بۆ خۆشويستنى و، پله به‌رزبوونـه‌وه‌ى مـرۆڤ لـه ناسينيدا و، لـه

ڕێی ڕەزامەندییەکانی ئەودا، بە ساڵێکی تەواو دادەنرێت. بەڵکو ئەو چرکەیە ژیانێکی باقی و هەمیشەییە و هەرگیز "نەمان" بە خۆیەوە نابینێت. بەڵام گەر ساڵێکی تەمەن - کە بێ گومان تەواو دەبێت و نامێنێت - لە پێناوی خوای گەورەدا بەسەر نەبرێت، ئەوا وەك چرکەیەکی کتوپڕی وایە. کەواتە ژیانی بێ ئاگایان هەرچەندەش درێژ بێت هێشتا وەك چەند دەم و ساتێکی کەمخایەن وایە، کە تەنها چرکەیەکیش تێپەڕ ناکات!

ئەم وتە بەناوبانگەی خوارەوە دەبێت بە بەڵگەی ئەم ڕاستییە، ئەوەتا دەڵێت:

"سِنَةُ الفِراقِ سَنَةٌ، وَسَنَةُ الوِصالِ سِنَةٌ"!

واتە: تەنها یەك چرکەی ماوەی جودایی و لێکدابڕان هێندە بە لای مرۆڤەوە درێژ خایەنە کە دەڵێی ساڵێکی تەواوە، کەچی ماوەی یەك ساڵی ڕەبەقی بە یەك شادبوون هێندە کورت و کەمخایەنە کە وەك ماوەی یەك چرکە وایە!

بەڵام من بە پێچەوانەی ئەم وتە بەناوبانگەوە دەڵێم:

یەك چرکەی تەمەن کە مرۆڤ لە بازنەی ڕەزامەندییەکانی خوای گەورە و لە پێناوی خواوەندی "باقی" و شکۆمەنددا بەسەری ببات، واتە یەك چرکەی ئەم بە یەك شادبوونە، نەك هەر تەنها وەك ساڵێك وایە، بەڵکو بە وێنەی پەنجەرەیەکی ئەوتۆیە کە بەسەر ژیانی باقی و هەمیشەییدا بڕوانێت!

هەروەها ئەو جودایی و لێکدابڕانەش کە لە نیگای ڕوانینی بێ ئاگایی و گومڕاییەوە بە جودایی و لێکبڕان دەردەکەوێت، نەك هەر ساڵێکی ڕەبەق وەك چرکەیەك لێ دەکات، بەڵکو هەزاران ساڵ دەکات بە ماوەی تەنها یەك چرکە لە پێش چاوی مرۆڤدا!

په‌ندێكی تر هه‌یه له‌وه‌ی پێشوو به‌ناوبانگتره و پشتی ئه‌م بۆچوونه‌ی ئێمه ده‌گرێت، ده‌ڵێت:

أرضُ الفلاةِ معَ الأعداءِ فنجانٌ سَمُّ الخِياطِ مع الأحبابِ ميدانُ[1]!

خۆ ئه‌گه‌ر بمانه‌وێت ڕوویه‌كی "ڕاست"ی ئه‌و وته‌یه‌ی پێشوو ده‌ربخه‌ین، ئه‌وا به‌م جۆره ده‌بێ كه:

ماوه‌ی به یه‌ك شادبوونی بوونه‌وه‌رانی "فانی" ماوه‌یه‌كی گه‌لێ كورته، ئه‌وه‌تا ماوه‌یه‌كی فانی‌یه و له‌ناوده‌چێت و نامێنێت. خۆ هه‌رچه‌نده‌ش درێژه بكێشێت هه‌ر هێشتا به كه‌م داده‌نرێت، چونكه به ماوه‌ی چاوتروو كاندنێك به‌سه‌رده‌چێت و ده‌بێت به خه‌ون و خه‌یاڵێكی كاتی و ڕێبوارانه‌ی ئه‌وتۆ كه دوای نه‌مانی خۆی خه‌م و په‌ژاره له دڵدا به‌جێ ده‌هێڵێت. كه‌واته "دڵی مرۆڤ" كه تامه‌زرۆ و تاسه‌مه‌ندی "مانه‌وه"یه له ساڵێكی ته‌واوی ئه‌م چه‌شنه به یه‌ك شادبوونانه، مه‌گه‌ر ته‌نها به ئه‌ندازه‌ی ماوه‌ی یه‌ك چركه، ده‌نا هیچ تام و له‌زه‌تێكی لێ ناچێژێت..

به‌ڵام جودایی هێنده درێژخایه‌نه و مه‌ودا و مه‌یدانه‌كه‌شی ئه‌وه‌نده فراوانه كه ته‌نها ماوه‌ی یه‌ك چركه، به قه‌ده‌ر ساڵێكی ڕه‌به‌ق، به‌ڵكو به ئه‌ندازه‌ی چه‌نده‌ها ساڵی زۆر، جودایی تێدا كۆ ده‌بێته‌وه. چونكه "دڵ"ی مرۆڤ كه موشتاقی مانه‌وه و تاسه‌مه‌ندی نه‌مری‌یه، هێنده خه‌م به جودایی ده‌خوات كه ته‌نانه‌ت جودایی ماوه‌ی یه‌ك دانه چركه‌ش ئازاری ده‌رخوارد ده‌دات و به چه‌شنێك پێوه‌ی ده‌تلێته‌وه كه ده‌ڵێی كه‌وتووه‌ته ژێر باری ئازاری قورسی

(١) واته: ده‌شتایی فراوان و به‌رین هێنده‌ی فنجانێك بچووكه ئه‌گه‌ر تیایدا له‌گه‌ڵ دوژمناندا بژیت، كونیله‌ی ده‌رزیش وه‌كو گۆڕه‌پانێكی گه‌وره وایه، ئه‌گه‌ر تیایدا له‌گه‌ڵ دۆست و هاوده‌ماندا بیت. (وه‌رگێڕ)

چەندین ساڵی جوداییەوە! چونکە جودایی ماوەی ئەو یەك چرکەیە چەندەها جۆری لەژمارەبەدەری جودایی تری یاد دەخاتەوە!

بەم جۆرە، دەرکەوت کە "ڕابوردوو" و "ئایندە"ی هەموو جۆرە خۆشەویستی‌یە نزمە ماددی‌یەکان، پڕن لە چەندەها جۆری لێکدابڕان و جودایی.

ئێمەش بەو بۆنەیەوە دەڵێین:

خەڵکینە!

ئایا دەتانەوێت تەمەنی کەم و فانیی خۆتان بگۆڕن بە تەمەنێکی باقی و درێژخایەن؟ تەنانەت بە تەمەنێك کە بەروبوومی سوود و قازانجتان بۆ بگرێت؟

مادەم وەڵامتان "بەڵێ"یە، کە وەڵامێکە مرۆڤێتیی مرۆڤ داخوازیەتی، ئەوا تەمەنتان لە پێناوی خواوەندی "باقی"دا بەسەر ببەن، چونکە هەر شتێك ڕوو لە "باقی" بکات، یەکێك لە درەوشانەوە باقی‌یەکانی ئەوی دەست دەکەوێت!

جا مادەم مرۆڤ زۆر بە توندوتیژی داوای تەمەنێکی درێژ دەکات و ئارەزوومەندی مانەوەیە و، "هۆکار"ێکیشی لە بەردەمدایە کە ئەم تەمەنە فانی‌یەی بۆ بگۆڕێت بە تەمەنێکی ئەوتۆ کە لەناوەرۆکدا درێژ بێت..

ئەوا بێ هیچ گومانێك، گەر مرۆڤ مرۆڤێتیی خۆی لەدەست نەدابێت، زۆر بە گەرمی و پەرۆشەوە بە دوای ئەو "هۆکار"ەدا دەگەڕێت و، هەموو شوێنێکی بۆ دەپشکنێت و، تێدەکۆشێت کە ئەو شتە گونجاوە بکات بە کردارێکی بەرجەستە و لەبەرچاو. بێ هیچ گومانێکیش بە هەموو هەڵسوکەوت و جموجوولەکانیەوە بەرەو ئەو ئەنجامە دەکەوێتە ڕێ.

ئه‌و هۆكاره‌ش ئه‌مه‌یه كه:

بۆ خوا كار بكه‌ن.. له‌به‌ر خوا به‌ یه‌ك بگه‌ن.. له‌ پێناوی خوادا تێبكۆشن.. با هه‌موو جموجووڵ و ڕه‌فتاریكتان له‌ چوارچێوه‌ی ڕه‌زامه‌ندیی خوا (واته: بۆ خوا.. له‌به‌ر خوا.. له‌ پێناوی خوا)دا بێت.. ئه‌و كاته‌ ده‌بینن كه‌ هه‌موو خوله‌كه‌كانی ئه‌م ته‌مه‌نه‌ كورته‌تان بووه‌ به‌ چه‌نده‌ها ساڵی زۆری درێژخایه‌ن.

"شه‌وی قه‌در" ئاماژه‌ بۆ ئه‌م ڕاستی‌یه‌ ده‌كات؛ چونكه‌ هه‌رچه‌نده‌ له‌ خۆیدا یه‌ك تاقه‌ شه‌وه‌، كه‌چی - به‌ ده‌قی قورئانی پیرۆز - له‌ هه‌زار مانگ باشتره‌. واته‌ له‌ حوكمی هه‌شتا و ئه‌وه‌نده‌ ساڵدایه‌!

ئاماژه‌یه‌كی تریش بۆ ئه‌م ڕاستی‌یه‌ هه‌یه‌، كه‌ بریتی‌یه‌ له‌و قاعیده‌یه‌ی له‌ لایه‌ن ئه‌هلی ویلایه‌ت و حه‌قیقه‌ته‌وه‌ سه‌لماوه‌ و پێی ده‌وترێ: "فراوان بوونی كات"(بسط الزمان) و، میعراجی پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌ كرده‌وه‌ ده‌یچه‌سپێنێت و ده‌ری ده‌خات. ئه‌وه‌بوو چه‌ند خوله‌كێكی كه‌م له‌و میعراجه‌دا هێنده‌ی ماوه‌ی چه‌نده‌ها ساڵ فراوان بوون و، ساته‌كانی میعراج به‌ ئه‌ندازه‌ی هه‌زاران ساڵ فراوانی و هه‌مه‌لایه‌نگیری و درێژییان به‌ده‌ست هێنا. چونكه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌ ڕێی میعراجه‌وه‌ ڕۆشته‌ ناو جیهانی به‌قاء(مانه‌وه‌)ه‌وه‌. خۆ ئاشكرایه‌ كه‌ چه‌ند خوله‌كێكی كه‌می جیهانی "باقی" جێی هه‌زاران ساڵی جیهانی "فانی"ی تێدا ده‌بێته‌وه‌.

هه‌روه‌ها - جگه‌ له‌ میعراج - ئه‌و ڕووداوه‌ زۆرانه‌ش كه‌ به‌سه‌ر ئه‌ولیا و پیاوچاكاندا هاتوون، ڕاستیی: (بسط الزمان) ده‌چه‌سپێنن. چونكه‌ هه‌ندێك له‌و ئه‌ولیایانه‌ له‌ ماوه‌ی یه‌ك خوله‌كدا ئه‌وه‌نده‌ كاروباریان ئه‌نجام داوه‌ كه‌ خه‌ڵكی تر مه‌گه‌ر له‌ ماوه‌ی یه‌ك ڕۆژدا ئه‌نجامی بده‌ن.. هه‌ندێكی تریان له‌ ماوه‌ی یه‌ك سه‌عاتدا هێنده‌ كاری گرنگی ڕایی كردووه‌ كه‌ به‌لای خه‌ڵكه‌وه‌

بە ماوەی ساڵێك ئنجا ڕایی دەکرێن.. هەندێکی تریشیان لە ماوەی یەك خولەکدا هەموو قورئانی پیرۆزی خەتم کردووە!

جا ئەم چەشنە ڕیوایەتانەی کە لەوانە دەگێڕرێنەوە هەرگیز گومان توخنیان ناکەوێت، چونکە ڕاوی‌یەکان هەموویان پیاوچاك و ڕاستگۆن و، خۆیان زۆر بەرزتر ڕاگرتووە لەوەی کە دابەزنە ئاستی قسەی دەمهەڵبەست و درۆ ڕێکخستن. چ جای ئەوەی کە ڕووداوەکانیش گەلێ زۆر و موتەواتیرن و لە ئەنجامی بینین و چاوپێکەوتنەوە ڕاوی‌یەکان دەیانگێڕنەوە.. کەواتە هەرگیز گومانیان تێدا نی‌یە و، "فراوانبوونی کات" ڕاستی‌یەکی چەسپاوە[١].

جۆرێکیشی هەیە کە هەموو کەسێك باوەڕی پێیەتی و تەسدیقی دەکات، کە بریتی‌یە لەو خەونانەی مرۆڤ دەیانبینێت و، هێندە حاڵ و باروودۆخی تێدا بەسەر دێت و ئەوەندەش قسەی تێدا دەکات و لەزەت و ئازاری تێدا دەچێژێت کە لە جیهانی بێداریدا پێویستیان بە ڕۆژێکی تەواو، تەنانەت لەوانەیە بە چەندەها ڕۆژ بێت!

**پوختەی ئەمانەی کە باس کران:**

هەرچەندە مرۆڤ بەدیهاتوویەکی "فانی"یە، کەچی بۆ "مانەوە" بەدی هێنراوە، چونکە بەدیهێنەرەکەی بە وێنەی ئاوێنەیەکی وێنە دەرەوەی درەوشانەوە باقی‌یەکانی خۆی بەدیی هێناوە و.. چەند ئەرکێکی ئەوتۆشی

---

(١) خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿قالَ قائِلٌ منهم كَمْ لَبِثْتُمْ قالُوا لَبِثْنَا يوماً أو بعضَ يومٍ﴾ (الكهف:١٩)، ﴿وَلَبِثُوا في كَهْفِهِم ثلاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعاً﴾ (الكهف:٢٥).
ئەم دوو ئایەتەی سەرەوە بەڵگەن لەسەر: کورتبوونەوەی کات(طي الزمان) هەروەك ئەم ئایەتەی خوارەوەش بەڵگەیە لەسەر فراوانبوونی کات(بسط الزمان):
﴿وإِنَّ يَوْماً عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّون﴾ (الحج:٤٧). (دانەر)

خستووه‌ته ئه‌ستۆی كه‌ به‌رهه‌می "باقی" ده‌به‌خشن و.. به‌ شێوه‌یه‌كی هێنده‌ جوانیش ڕوخساری ئه‌وی كێشاوه‌ كه‌ كردوویه‌تی به‌ خولگه‌ی نه‌خش و نیگاری دره‌وشانه‌وه‌ی ناوه‌ جوانه‌كانی.

له‌به‌ر ئه‌وه‌، به‌خته‌وه‌ری و كارمه‌ندیی بنه‌ڕه‌تیی ئه‌م مرۆڤه‌ له‌وه‌دایه‌ كه‌:

به‌ هه‌موو هێز و ئه‌ندام و هه‌ستێكی و به‌ سه‌رجه‌م توانا و لێهاتنه‌ سروشتی‌یه‌كانیه‌وه‌ ڕوو بكاته‌ ئه‌و "باقی"یه‌ و.. له‌ پێناوی ڕه‌زامه‌ندیی ئه‌ودا هه‌نگاو بنێت و.. ده‌ست به‌ ناوه‌ جوانه‌كانیه‌وه‌ بگرێت و.. به‌ وێنه‌ی دووپات كردنه‌وه‌ی "زمان"ی، به‌ سه‌رجه‌م لایه‌نه‌ ناسكه‌كانی چه‌شنی "دڵ" و "ڕۆح" و "ژیری"یشی، هه‌میشه‌: "یا باقي أنت الباقي" دووپات بكاته‌وه‌!

هو الباقي، هو الأزلي الأبدي، هو السرمدي، هو الدائم، هو المطلوب، هو المحبوب، هو المقصود، هو المعبود.

﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

﴿رَبَّنَا لا تُؤاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾.

بریسکەی چوارەم:

## میهرەبانیی پێغەمبەر ﷺ

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ ما عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ ۞ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللهُ لا إلهَ إلاّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ العَظِيمِ﴾ (التوبة:١٢٨-١٢٩).

﴿قُلْ لا أَسْئَلُكُم عَلَيْهِ أَجْراً إلاّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ (الشورى: ٢٣).

وا لە نێوان "دوو مەقام"دا ئاماژە بۆ کۆمەڵە ڕاستییەکی مەزن دەکەین کە لە دەریای ئەم ئایەتە مەزنانەدا شەپۆل دەدەن:

### مەقامی یەکەم

"لە چوار سەرنج پێکهاتووە"

❑ سەرنجی یەکەم:

ئەم سەرنجە، کەماڵی میهرەبانی و بەزەیی نەبڕاوەی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بە نەتەوەکەی دەردەخات:

بەڵێ، چەندین ڕیوایەتی صەحیح هەن مەودای میهرەبانیی کامڵ و شەفەقەتی تەواوی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە نەتەوەکەی دەردەخەن، وەك ئەو ڕیوایەتەی کە ڕوونی دەکاتەوە:

له‌ ڕۆژی حه‌شری مه‌زن و له‌و ده‌مه‌دا كه‌ هه‌موو كه‌سێك ته‌نانه‌ت پێغه‌مبه‌رانیش - دروودیان له‌سه‌ر بێت - له‌تاو سام و شكۆ و هه‌یبه‌تی ئه‌و ڕۆژه‌دا ده‌ڵێن: "نفسي.. نفسي"، پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ له‌و ڕۆژه‌دا ده‌فه‌رموێ: "أُمّتي.. أُمّتي"[1]..

جا هه‌روه‌ك ئه‌م ڕیوایه‌تانه‌ی كه‌ شه‌فه‌قه‌تی مه‌زنی پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌رامبه‌ر نه‌ته‌وه‌كه‌ی ڕوون ده‌كه‌نه‌وه‌ ئه‌مه‌یان گه‌یاند، له‌ كاتی له‌دایكبوونیشیدا دایكی به‌ڕێزی گوێی لێ بووه‌ كه‌ به‌و ساوایه‌شی هه‌ر به‌ نزای: "أُمّتي.. أُمّتي" لاڵاوه‌ته‌وه‌، هه‌روه‌ك لای ئه‌هلی كه‌شفی ئه‌ولیا و پیاوچاكانه‌وه‌ پشت ڕاست كراوه‌ته‌وه‌.

جگه‌ له‌مانه‌، سه‌رجه‌می ژیانی به‌پیت و پیرۆزی و، ئه‌و ڕه‌وشته‌ ڕه‌نگین و به‌رز و به‌سۆز و میهره‌بانییانه‌ش كه‌ له‌ سه‌رانسه‌ری ئاسۆكانی جیهاندا بلاوی كردنه‌وه‌، كه‌مالی سۆز و به‌زه‌یی و شه‌فه‌قه‌تی ئه‌و ده‌رده‌خه‌ن.

هه‌روه‌ك - له‌ ڕوویه‌كی تره‌وه‌ - پێغه‌مبه‌ر ﷺ خۆیشی شه‌فه‌قه‌ته‌ مه‌زنه‌كه‌ی به‌رامبه‌ر نه‌ته‌وه‌كه‌ی به‌ پێویستیی بێ سنووری خۆی ده‌رخستووه‌ به‌و سلاواتانه‌ی كه‌ نه‌ته‌وه‌كه‌ی پێشكه‌شی ده‌كه‌ن. ئه‌مه‌ش مه‌ودای په‌یوه‌ندی‌یه‌ میهره‌بانه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌ سه‌رجه‌می به‌خته‌وه‌ری‌یه‌كانی نه‌ته‌وه‌كه‌یه‌وه‌، ده‌رده‌خات.

له‌ ڕووناكیی ئه‌م میهره‌بانی‌یه‌ گشتی و سۆز و به‌زه‌ییه‌ فراوانه‌ی ئه‌م ڕابه‌ره‌ میهره‌بانه‌دا ﷺ ده‌رده‌كه‌وێت كه‌: پشت هه‌ڵكردن له‌ سوننه‌تی پیرۆز و

---

(١) جزء من حديث الشفاعة الطويل، والحديث بطوله أخرجه البخاري برقم: ٣٣٤٠ و ٣٣٦١ و ٤٧١٢ ومسلم برقم: ١٩٤ والترمذي برقم: ٤٥٥١ "تحفة" كلهم من حديث أبي هريرة رضي الله عنه، باختلاف في السياق. (وه‌رگێڕ - له‌ چاپه‌ عه‌ره‌بی‌یه‌كه‌ی "اللمعات"ه‌وه‌)

خاوێنی، لە ڕاستیدا ناشکوری و بێ نەزانینێکی گەلێ گەورەیە، تەنانەت بە مردنی ویژدانیش لە قەڵەم دەدرێت.

بەڵێ، لەم دەرەنجامە تێبگە و بۆ خۆت لێکی بدەرەوە.

❑ سەرنجی دووهەم:

پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە ناوەندی ئەرکی گەورە و گشتیی "پێغەمبەرایەتی‌یەکەی"دا، میهرەبانی‌یە مەزنەکەی خۆی بەرامبەر چەند کاروبارێکی جوزئی و تایبەتی دەرخستووە..

جا بەکارهێنانی ئەو شەفەقەتە مەزن و میهرەبانی‌یە فراوانە بۆ ئەو بابەت و کاروبارە جوزئییانە بە پێی "ڕواڵەت" لەگەڵ گەورەیی ئەرکی پێغەمبەرێتیدا ناگونجێ. بەڵام بە پێی "ڕاستی و واقیع" ئەو بابەتە جوزئی و کارە تایبەتییانە، نوێنەر و پێشەنگی سەرەتای زنجیرەیەکن کە لە داهاتوودا ئەرکی گشتیی پێغەمبەرایەتی‌یەکەی دەگرنە ئەستۆ، بۆیە ئەو بایەخە زۆرەی بە نوێنەری ئەو زنجیرەیە داوە.

بۆ نموونە:

ئەو شەفەقەتە زۆر و گرنگی‌یە لەڕادەبەدەرەی کە پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر حەزرەتی حەسەن و حسەین - لە تافی منداڵییاندا - نواندی، تەنها خۆشەویستی و شەفەقەتێکی سروشتی و هەڵقوڵاوی هەستی پەیوەندیی خزمایەتی نی‌یە، بەڵکو جگە لەمەش، لە سەرچاوەی ئەو بەسیرەتەوە هەڵقوڵاوە کە دەبینێت ئەم دوانە سەرەتای زنجیرەیەکی نوورانیی ئەوتۆن لە داهاتوودا ئەرکێکی گرنگی "پێغەمبەرایەتیی مەزن"ی ئەو ڕادەپەڕێنن و، هەریەکەیان سەرچاوە و نوێنەر و پێشەوای کۆمەڵێکی گەورەی میراتگری پێغەمبەر ﷺ دەبن.

به‌ڵێ، پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌به‌ر گه‌لێ كه‌سی میراتگری ئه‌ركی پێغه‌مبه‌رێتی‌یه‌كه‌ی، له‌وانه‌ی كه‌ وه‌ك "مه‌هدی" وان و هه‌ڵگری شه‌ریعه‌ته‌ بێگه‌رده‌كه‌ین و له‌ نه‌وه‌ و وه‌چه‌ی نووارنی و پیرۆزی حه‌زره‌تی حه‌سه‌نن وه‌ك شێخی گه‌یلانی[1]، حه‌زره‌تی حه‌سه‌نی له‌ ئامێز گرتووه‌ و به‌كه‌ماڵی سۆز و شه‌فه‌قه‌ت و میهره‌بانی‌یه‌وه‌ سه‌ری ماچ كردووه‌. چونكه‌ پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ له‌ ڕێی بینایی و به‌سیره‌تی پێغه‌مبه‌رێتی‌یه‌وه‌ ئه‌و ئه‌ركه‌ خاوێن و مه‌زنانه‌ی بینیوه‌ كه‌ ئه‌و به‌ڕێزانه‌ له‌ داهاتوودا ده‌یانگرنه‌ ئه‌ستۆ. بۆیه‌ پێشه‌كی ڕێزی له‌ كار و خزمه‌تگوزاری‌یه‌كانیان ناوه‌ و، له‌ بریی هه‌موویان، وه‌ك نیشانه‌یه‌كی ڕێز و پێزانین و هاندان، سه‌ری حه‌زره‌تی حه‌سه‌نی ماچ كردووه‌!

پاشان ئه‌و بایه‌خه‌ مه‌زنه‌ی كه‌ پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ به‌ حه‌زره‌تی حه‌سه‌ینی داوه‌ و سۆزی گه‌رم و به‌تینیشی به‌رامبه‌ری ده‌ربڕیوه‌، له‌به‌ر ئه‌و پێشه‌وا و مه‌رده‌ مه‌زنانه‌یه‌ كه‌ میراتگری ڕاسته‌قینه‌ی پێغه‌مبه‌رێتی‌یه‌كه‌ین و

---

(١) شێخ عه‌بدولقادری گه‌یلانی له‌ ساڵی ٤٧٠ی كۆچی له‌ گه‌یلان هاتووه‌ته‌ دنیا و، له‌ نه‌وه‌ی حه‌زره‌تی حه‌سه‌نه‌. بۆ خوێندن ڕۆیشتووه‌ بۆ به‌غدا و سه‌رجه‌می زانسته‌ ئیسلامی‌یه‌كانی ئه‌و ڕۆژگاره‌ی لای زانایانی پایه‌ به‌رزی به‌غدا خوێندووه‌. یه‌كێكه‌ له‌ گه‌وره‌ خزمه‌تگوزارانی ئایینی ئیسلام و، چه‌نده‌ها كه‌س له‌ گاور و جووله‌كه‌كان له‌ خزمه‌تیدا موسڵمان بوون و هه‌زاران موسڵمانیش له‌سه‌ر ده‌ستیدا تۆبه‌یان كردووه‌ و ده‌ستبه‌رداری كرده‌وه‌ خراپه‌كان بوون. چه‌ند كتێبێكی له‌ دوای خۆی به‌جێ هێشتووه‌ وه‌ك (الغنية) و (فتوح الغيب) و (الفتح الرباني). له‌ ساڵی ٥٦١ك له‌ ته‌مه‌نی نه‌وه‌د ساڵیدا كۆچی دوایی كردووه‌ و له‌ قوتابخانه‌كه‌ی خۆی له‌ به‌غدا نێژراوه‌. بۆ مه‌به‌ستی ناسینی پایه‌به‌رزیی ئه‌م مه‌رده‌ مه‌زنه‌ و ئاشنا بوون به‌ ڕۆڵی كاریگه‌ری له‌ مێژووی ئیسلامدا، خوێنه‌ری به‌ڕێز ڕه‌وانه‌ی ئه‌و فه‌سڵانه‌ ده‌كه‌ین كه‌ مامۆستای مێژوونووسی هاوچه‌رخ (أبو الحسن الندوي) خوا لێی خۆش بێت، له‌ به‌رگی یه‌كه‌می (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)دا تۆماری كردوون، هه‌روه‌ها كتێبی: (هكذا ظهر جيل صلاح الدين وهكذا عادت القدس) نووسینی: (د. ماجد عرسان الگيلاني) به‌ تایبه‌ت (الفصل الحادي عشر: مدارس الإصلاح والتجديد، المدرسة القادرية). (وه‌رگێر)

چەشنی "مەهدی" وان و لە نەوەی نوورانیی حەزرەتی حسەینن، وەك: حەزرەتی "زەینولعابیدین"[١] و "جەعفەری صادق"[٢]. بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ لەبەر هەموو ئەو گەورە مەردانەی کە لە داهاتوودا سەری ئیسلام بەرز دەکەنەوە و لە دوای خۆی ئەرکی پێغەمبەرایەتی‌یەکەی ڕادەپەڕێنن، گەردنی حەزرەتی حسەینی ماچ کرد و شەفەقەتی لە ڕادە بەدەر و کەماڵی بایەخ پێدانی لە ئاستدا دەربڕی!

بەڵێ، ڕوانینی ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە هێشتا لە دنیادا بووە و لە باشترین سەدەی بەختەوەریدا ژیاوە بە "دڵی هاوڕاز و ڕاهاتووی لەگەڵ غەیبی پەنهان"دا مەیدانی حەشری بەرینی ناو جیهانی ئەودنیای هەتاهەتایی بینیوە.. ئەو ڕوانینەی کە هەر لەسەر زەوی‌یەوە بەهەشتی ناو ئاسمانە بەرزەکانی پێ دیوە و سەیری مەلائیکەتی پێ کردووە.. کە ڕووداوە شارراوەکانی پشتی پەردەی تاریك و دێرینی (هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە، دروودی لەسەر بێت) چاو لێ بووە، تەنانەت بە بینینی خواوەندی مەزنیش شەرەفمەند و بەختەوەر بووە.. بێ هیچ گومانێك ئەم ڕوانینە نوورانی و

---

(١) زەینولعابیدین: (٣٦-٩٤ کۆچی) ناوی عەلی و کوڕی حەزرەتی حسەینی کوڕی حەزرەتی عەلی‌یە، خوا لە هەموویان ڕازی بێت. هێندە سەرقاڵی خواپەرستی بووە کە بە نازناوی "زەینولعابیدین" و "سەججاد" ناوبانگی دەرکردووە. باپیری سەرجەم ساداتی حسەینی‌یە. لە لایەن خەڵکی ڕۆژگاری خۆی بە: (زانست و تەقوا و تەوازوع و ئارام و پێشەوای شارەزای ڕازەکانی قورئان و سوننەت و ئیمانی دامەزراو) ناسراو بووە. کۆمەڵێ ئامۆژگاری و گوفتاری پڕ لە پەند و دانستی دوای خۆی بەجێ هێشتووە. (وەرگێڕ)

(٢) ئیمام جەعفەری صادق (٨٠-١٤٨ك/٦٩٩-٧٦٥ز) کوڕی ئیمام محەممەد باقری کوڕی ئیمام عەلی زەینولعابیدینی کوڕی حەزرەتی حسەینە، خوا لە هەموویان ڕازی بێت. یەکێکە لە گەورە مەردانی تابیعین و پلەیەکی بڵندی لە زانستدا بووە و چەند کەسێکی پایە بەرزی وەك ئیمامی ئەبوو حەنیفە و ئیمامی مالیك دەرسیان لە لا خوێندووە. لە دایك بوون و کۆچی دوایشی لە شاری مەدینەدا بووە. (وەرگێڕ)

به‌سیره‌ته داهاتوو بینه، قوتبه گه‌وره‌كان و پێشه‌وایانی میراتگری ئه‌ركی پێغه‌مبه‌رایه‌تی و مه‌هدییانی داهاتووی نه‌وه‌ی حه‌زره‌تی حه‌سه‌ن و حسه‌ینی دیوه و، له‌ بریی هه‌موو ئه‌وانه‌، سه‌ری ئه‌مانی ماچ كردووه‌!

به‌ڵێ، ماچكردنی سه‌ری حه‌زره‌تی حه‌سه‌ن - خوای لێ ڕازی بێت - له‌ لایه‌ن پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ ﷺ به‌شێكی گه‌وره‌ی شێخی گه‌یلانیی تێدایه‌!

❑ سه‌رنجی سێهه‌م:

واتای ئایه‌تی: ﴿إِلاَّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ - به‌ پێی ته‌فسیر و بۆچوونێك - ئه‌وه‌یه‌ كه‌:

پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ له‌ كاتی ئه‌نجامدانی كاری پێغه‌مبه‌رێتی‌یه‌كه‌یدا جگه‌ له‌ خۆشویستنی ئالی به‌یته‌كه‌ی هیچ پاداشتێكی تری له‌ كه‌س ناوێت.

ئه‌گه‌ر بوترێت:

كه‌واته‌ به‌پێی ئه‌م واتایه‌ پاداشتێك له‌ ڕووی خزمایه‌تی‌یه‌وه‌ ڕه‌چاو كراوه‌، كه‌چی ئایه‌تی پیرۆزی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات:١٣) به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌ركی پێغه‌مبه‌رایه‌تی‌یه‌كه‌ی له‌ ڕووی: (خۆ نزیك كردنه‌وه‌ی مرۆڤه‌وه‌ له‌ خوای گه‌وره‌، به‌ ته‌قوا) به‌رده‌وام ده‌بێت.. نه‌ك له‌ ڕووی (خزمایه‌تی‌یه‌وه‌)!

له‌ وه‌ڵامدا ده‌ڵێین:

پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌و ڕوانینه‌ هاوڕاز و ئاشنا له‌گه‌ڵ غه‌یبه‌ی كه‌ خوای گه‌وره‌ پێی به‌خشیبوو، بینیبووی كه‌: له‌ داهاتوودا ئالی به‌یتی وه‌ك دره‌ختێكی مه‌زن و نوورانییان لێ دێت؛ لق و په‌ل بۆ سه‌رجه‌می جیهانی ئیسلام ده‌هاوێن و.. زۆربه‌ی ڕه‌ها و گشتیی ئه‌و كه‌سانه‌ش كه‌ چینه‌ جیاجیاكانی جیهانی ئیسلامی به‌ره‌و خێر و ڕاسته‌ شه‌قامی هیدایه‌ت ڕێنمایی ده‌كه‌ن و، نموونه‌ی به‌رجه‌سته‌ی هه‌موو كه‌ماڵاتی مرۆڤن، له‌ناو ئالی به‌یتدا سه‌ر هه‌ڵده‌ده‌ن.

هەروەها پەردەی لە ڕووی ئەوەش لاداوە کە دوعای نەتەوەکەی لە تەحیاتی نوێژدا سەبارەت بە "ئالی بەیت" لای خوای گەورە گیرا بووە، کە بریتی‌یە لە:

"اللهم صل على محمدٍ وعلى آل محمد، كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم في العالمين، انك حميد مجيد".

واتە: هەروەك زۆربەی ڕابەرانی نوورانی و هیدایەتدەرانی نەتەوەی حەزرەتی ئیبراهیم - درورودی لەسەر بێت - پێغەمبەرن و لە نەوە و ئالی ئەون.. بە هەمان جۆر، پێغەمبەر ﷺ بینیویەتی کە قوتبەکانی ئالی بەیت لە داهاتووی نەتەوەی حەزرەتی موحەممەددا ﷺ بە چەشنی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل ئەرکی مەزنی خزمەتگوزاریی هەمەلایەنە و جۆراوجۆری ئایینی ئیسلام دەگرنە ئەستۆ و ڕایدەپەڕێنن..

لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دراوە کە بڵێت: ﴿قُلْ لا أَسْئَلُكُم عَلَيْهِ أَجْراً إِلاّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ و، داوای خۆشویستنی ئالی بەیتی لە نەتەوەکەی کردووە.

ئەو بەڵگەیەش کە پشتی ئەم ڕاستی‌یە دەگرێت ئەوەیە کە لە ڕیوایەتی تردا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "يا أيها الناس إني قد تركت فيكم ما إن أخذتم به لن تضلّوا: كتاب الله وعترتي أهل بيتي"[1]. چونکە ئالی بەیت سەرچاوە و پارێزگارانی سونەتی خاوێنی پێغەمبەرن ﷺ و، یەکەم کۆمەڵن شوێن پێ هەڵگرتنی سوننەتیان لە ئەستۆ نراوە.

---

(١) حديث صحيح، أخرجه الترمذي برقم: ٣٧٨٦ والطبراني في الكبير: ٢٦٨٠ وللحديث شواهد كثيرة. أنظر الأحاديث الصحيحة رقم: ١٧٦١. (وەرگێڕ - لەچاپە عەرەبی‌یەکەی "اللمعات"ەوە)

به‌م جۆره و به‌م واتا و ناوه‌رۆكانه‌ی ئێستا لێره‌دا باس كران، ڕاستیی ئه‌م فه‌رمووده‌یه ڕوون ده‌بێته‌وه. واته به شوێنكه‌وتنی ته‌واوه‌تیی قورئان و سوننه‌تی پیرۆز..

به واتایه‌كی تر:

مه‌به‌ست له ئالی به‌یت له ڕووی ئه‌ركی پێغه‌مبه‌رایه‌تی‌یه‌وه شوێن پێ هه‌ڵگرتنی سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ره ﷺ. چونكه ئه‌و كه‌سه‌ی واز له سوننه‌تی پیرۆز ده‌هێنێت - له ڕاستیدا - له ئالی به‌یت نا‌ژمێررێت و، هه‌رگیز ناكرێ لایه‌نگری ڕاسته‌قینه‌ی ئالی به‌یت بێت.

پاشان حیكمه‌تی ویستی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له كۆكردنه‌وه‌ی نه‌ته‌وه‌كه‌ی له ده‌وری ئالی به‌یتدا ئه‌وه‌یه كه:

پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ به ڕوخسه‌تێكی خوایی، زانیبووی: به تێپه‌ڕبوونی كات وه‌چه‌ی ئالی به‌یت زیاد ده‌بن و ئایینی ئیسلامیش له ژیانی موسڵماناندا به‌ره‌و لاوازی ده‌ڕوات، جا له كاتێكی ئاوادا كۆمه‌ڵێكی هاوپه‌یوه‌ندی و یه‌كگرتووی له‌وپه‌ڕی هێز و زۆریدا بۆ موسڵمانان به پێویست داده‌نرێت، تاكو ببێت به مه‌ڵبه‌ند و ته‌وه‌ره‌یه‌ك بۆ به‌ره‌و پێش چوونی جیهانی مه‌عنه‌ویی ئیسلام. پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌مه‌ی به "ڕوخسه‌تی خوای گه‌وره" زانیوه و، ویستوویه‌تی نه‌ته‌وه‌كه‌ی خۆی له‌و ڕۆژگارانه‌دا له ده‌وری ئالی به‌یتی جه‌م بكات.

به‌ڵێ، هه‌رچه‌ند له ئیمان و بیر و باوه‌ڕدا ئالی به‌یت پێشكه‌وتووتر نین به‌سه‌ر كه‌سانی تردا، به‌ڵام له ملكه‌چبوون و لایه‌نگرتن و "وه‌لاء"دا بۆ ئیسلام گه‌لێ پێشیان ده‌كه‌ون، چونكه ئه‌وان به فیطره‌ت و وه‌چه و سروشت وه‌لائیان بۆ ئیسلامه، وه‌ك ئاشكراشه لایه‌نگیری و وه‌لائی سروشتی، با

لاواز و نادیار و تەنانەت لەسەر ناحەقیش بێت، لە لایەن خاوەنەکەیەوە وازی لێ ناهێنرێت، چ جای وەلاء و لایەنگیری بۆ ڕاستییەك کە زنجیرەی باپیرانی پەیوەستی بوون و گیانیان لە پێناودا بەخت کردووە و شەرەفمەندی و سەربەرزییان پێ بەدەست هێناوە. دیارە ڕاستیی ئاوا، لەوپەڕی هێز و لە چلەپۆپەی شەرەفمەندیدایە و، لەسەر ڕێی "ڕاست"ی ڕوون و ئاشکرایە.

ئایا کەسێك بە ڕوونی لە ناخی خۆیدا هەست بە مەودای ڕەسەنایەتیی ئەم وەلاء و لایەنگیرییە سروشتییە بۆ ئیسلام بکات، دەتوانێت دەستبەرداری بێت و وازی لێ بهێنێت؟

جا ئالی بەیت بەم دەست پێوەگرتنە توند و گەرمەیان بە ئیسلامەوە – کە ئیلتیزام و دەست پێوەگرتنێکی سروشتییە - "نیشانەی ئاسایی" لەسەر ڕاستیی ئایینی ئیسلام وەك "بەڵگەی بەهێز" وایە لە لایان، چونکە ئەوان بە سروشت لایەنگری ئیسلامن. بەڵام کەسانی تر دوای قەناعەت کردنیان نەبێ لە ڕێی "بەڵگەی بەهێز"ەوە، ئیلتیزام بە ئیسلامەوە ناکەن!

مەكتووبی هەشتەم:

# شەفەقەت لە خۆشەویستی بلندترە

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

گەلێ دانستی زۆر لەوەدا هەیە کە هەردوو ناوی: "الرحمن الرحیم" ڕۆشتوونەتە ناو "بەسمەلە"وە و، لە سەرەتای هەموو کارێکی گرنگیشەوە دەوترێن..

پشت بە خوا ڕوونکردنەوەی ئەو دانستانە بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین. بەڵام لێرەدا لە هەست و نەستێکی تایبەت بە خۆم دەدوێم.

برام! من دەبینم دوو ناوی "الرحمن الرحیم" نوور و ڕووناکی‌یەکی ئەوتۆیان هەیە کە دەوراندەوری سەرانسەری گەردوونی داوە و، هێندەش هێز و درەخشانییان بۆ هەموو ڕۆحێك تێدا دەبینم کە سەرجەمی پێداویستی‌یە هەمیشەییەکانیان نەهێڵێت و لە دوژمنە زۆر و لەژمارە بەدەرەکانیشیان ڕزگاریان بکات..

چونکە بۆم دەرکەوت کە گرنگترین هۆکار و ڕێی گەیشتن بەم دوو نوورە مەزنە بریتی‌یە لە: "هەژاری لەگەڵ شوکرانەبژێری" و "کۆڵەواری لەگەڵ شەفەقەت"دا..

بە واتایەکی تر بریتی‌یە لە: "بەندایەتی" و "هەژاری".

جا بە بۆنەی ئەم مەسەلەیەوە، من بە پێچەوانەی ڕای زانا لێکۆڵەرەکان، تەنانەت بە پێچەوانەی ڕای مامۆستاکەشم کە ئیمامی ڕەببانی‌یە، دەڵێم:

ئەو هەست و سۆزە توندوتیژ و درەخشانەی کە حەزرەتی یەعقووب بەرامبەر بە حەزرەتی یووسف - درووودیان لەسەر بێت - دەری بڕیوە، هەڵقوڵاوی "عیشق" و "مەحەببەت" نین، بەڵکو لە کانیاوی شەفەقەتەوە هەڵقوڵاون. چونکە شەفەقەت لە عیشق و مەحەببەت کاریگەرترە و لە هەردوو کیشیان درەخشانتر و بەرزتر و خاوێنترە. کەواتە شەفەقەت شایانترە بۆ پلە و پایەی "نبووەت".

بەڵام "مەحەببەت" و "عیشق" شایانی پلە و پایەی نبووەت نین، گەر بە توندی ئاراستەی خۆشەویستانی مەجازی و بەدیهاتووان بکرێن.

واتە ئەو هەست و سۆزانەی حەزرەتی یەعقووب بەرامبەر بە حەزرەتی یووسف - درووودیان لەسەر بێت - کە قورئانی پیرۆز لە درەخشانترین شێوە و بریسکاوەترین ئیعجازدا باسی کردووە و هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە ناوی "الرحیم"ی خوای گەورە، بریتی‌یە لە پلەیەکی یەکجار بەرز و بلندی "شەفەقەت".

بەڵام "عیشق" کە هۆی گەیشتنە بە ناوی "الودود"ی خوای گەورە، لە خۆشەویستیی "زولەیخا"ی خێزانی عەزیزدا بۆ حەزرەتی یووسف - درووودی لەسەر بێت - دەبینرێت.

کەواتە قورئانی پیرۆز لە چ مەودایەکی بڵند و باڵادا بەرزیی هەست و سۆزەکانی حەزرەتی یەعقووب بەسەر هەست و سۆزەکانی زولەیخادا ڕوون دەکاتەوە، لە هەمان مەوداشدا بەرزیی "شەفەقەت" لە چاو "مەحەببەت"دا دەخاتە ڕوو!

مامۆستاكه‌م (ئیمامی ڕه‌ببانی)(١) فه‌رموویه‌تی:

"جوانیی حه‌زره‌تی یووسف له‌ جۆری جوانی‌یه‌كانی دوارۆژ بووه. كه‌واته ئاراسته كردنی مه‌حه‌بیه‌ت به‌رامبه‌ر به‌و جوانی‌یه له جۆری مه‌حه‌بیه‌ته مه‌جازی‌یه‌كان نی‌یه، هه‌تا قسوور و ناته‌واویی بدرێته پاڵ"(٢)..

---

(١) "ئیمامی ڕه‌ببانی" (٩٧١-١٠٣٤ ك) ناوی (ئه‌حمه‌دی كوڕی عه‌بدوله‌حه‌د)ه و خه‌ڵكی (سه‌رهه‌ند)ی هیندستانه و نازناوی به "فارووقی" بڵاوبووه‌ته‌وه چونكه له نه‌وه‌ی حه‌زره‌تی عومه‌ری كوڕی خه‌تتابه، خوای لێ ڕازی بێت. نوێكاری ئایین(مجدد) بووه له سه‌ره‌تای هه‌زاره‌ی دووهه‌می كۆچیدا و به ڕاستیش ئه‌ركی تازه كردنه‌وه‌ی به‌جێ هێناوه. له زانسته‌كانی سه‌رده‌می خۆیدا ده‌ستێكی تابلێی باڵای بووه، جگه له‌وه‌ی كه خاوه‌نی ده‌روونێكی پاك و ئیخلاسێكی كه‌م وێنه و ڕۆحێكی په‌روه‌رده كراو بووه له به‌ندایه‌تییدا بۆ خوای گه‌وره و، دڵێكی هه‌میشه بێداری بووه. چه‌ندین جار پله‌وپایه‌ی به‌رزی دراوه‌تێ هیچیانی وه‌رنه‌گرتووه. ئه‌و ئاشووبه‌ی (ئه‌كبه‌رشا)ی هیند بۆ له‌ناوبردنی ئیسلام هه‌ڵی گیرساند، ئه‌م زاته توانیی به‌ره‌نگاری ببێته‌وه و ڕووبه‌ڕووی ڕابووه‌ستێت و ده‌وڵه‌تی مه‌غۆل له هیندستاندا له "ئیلحاد" و "بێ بڕوایی" و "به‌رهه‌می"یه‌وه بگێڕێته‌وه بۆ باوه‌شی ئیسلام له ڕێی بڵاو كردنه‌وه‌ی په‌یڕه‌وی به‌یعه‌ت و برایه‌تی و ڕێنمایی خه‌ڵكی‌یه‌وه و، توانیی (ته‌صه‌ووف) له‌و شتانه‌ی تێكه‌ڵی بووبوون و لێلیان كردبوو، پاك بكاته‌وه. به‌م پێیه ئیمامی ڕه‌ببانی به خۆری تیشكداری قوتابخانه‌ی نه‌قشبه‌ندی ده‌ژمێررێت له ته‌صه‌ووفدا. بانگه‌وازه‌كه‌ی به شێوه‌یه‌كی به‌ربڵاو له نیوه دوورگه‌ی هینددا بڵاو بووه‌وه و، یه‌كێك له به‌روبوومه‌كانی (ئۆرنگ زیب)شای خواناس بوو كه له سه‌رده‌می فه‌رمانڕه‌وایی ئه‌ودا سه‌ری ئیسلام و موسڵمانان به‌رز بووه‌وه و كافرانیش سه‌رشۆڕ كران. ته‌ریقه‌ته‌كه‌ی به‌هۆی گه‌وره زانا و كه‌سایه‌تیی به‌ناوبانگی كورد: "مه‌ولانا خالیدی نه‌قشبه‌ندی"یه‌وه (١١٩٢-١٢٤٢ ك) له هه‌موو جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبووه‌ته‌وه.. چه‌ند به‌رهه‌مێكی دوای خۆی به‌جێ هێشتووه، به‌ناوبانگه‌كه‌یان "مه‌كتووبات"ه كه "محه‌ممه‌د موراد مه‌نزیله‌وی" كردوویه‌تی به عه‌ره‌بی. هه‌روه‌ك له‌م ساڵانه‌ی دواییدا (ساڵی ١٤٢٥ كۆچی) مامۆستا محه‌ممه‌د ئه‌یوبی گه‌نجی له سنه لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی ڕێكوپێكی له ده‌قه فارسی‌یه‌كه‌ی مه‌كتووباتدا به ئه‌نجام گه‌یاندووه و، له لایه‌ن ئینتیشاراتی صدیقی له زاهیدان به چاپێكی قه‌شه‌نگ و به‌رگێكی جوان بڵاو كراوه‌ته‌وه. خوا پاداشتی خێریان بداته‌وه. (وه‌رگێڕ)

(٢) بڕوانه: (مكتوبات الإمام الرباني) ج٣/ص١٣٤ مه‌كتووبی سه‌دهه‌م. (وه‌رگێڕ)

چونکە ئیمامی ڕەببانی پێی وایە عیشقی مەجازی بە تەواوی شایانی مەقامی "پێغەمبەرایەتی" نی‌یە.

بەڵام من دەڵێم:

ئەی مامۆستای بەڕێزم!

ئەمە تەئویلێکی دژوارە! دەبێ حەقیقەت بەم جۆرە بێت:

ئەو هەست و سۆزانە، هەست و سۆزی "مەحەببەت" نین، بەڵکو پلەیەکی "شەفەقەت"ن کە سەد هێندەی مەحەببەت درەخشانتر و فراوانتر و بەرز و بلندترە.

بەڵێ، هەموو جۆرەکانی "شەفەقەت" ناسك و خاوێنن.. بەڵام زۆر جۆری "عیشق" و "مەحەببەت" هەن کە تەنازولیان بۆ ناکرێت!

پاشان ئەوەش هەیە کە "شەفەقەت" فراوانە، چونکە ئەو باوکەی کە شەفەقەتی بۆ منالەکانی خۆی هەیە، بەرامبەر هەموو منالێکی بچووك تەنانەت بەرامبەر گیانلەبەرانیش خاوەنی شەفەقەت و بەزەییە و، بەم کارەش یەکێك لە نوورەکانی ناوی "الرحیم"ی خوای گەورە دەردەخات کە دەورانەوەری هەموو شتێکی داوە. بەڵام "عیشق" خۆشەویستیی مرۆڤ تایبەت دەکات تەنها بە خۆشەویستەکەی خۆی، بە ڕادەیەك کە لەو پێناوەدا واز لە هەموو شتێکی تر دەهێنێت، یان بە شێوەیەکی ناوەکی(ضمني) زەمی ئەوانی تر دەکات و، لە شان و شکۆیان دادەبەزێنێت، تاکو ڕێز و بایەخی خۆشەویستەکەی بەرز ڕابگرێت!

بۆ نموونە یەکێك لە عاشقان وتوویەتی:

(خۆر کاتێ جوانیی خۆشەویستەکەم دەبینێت شەرم دەیگرێت و لە پشت پەردەی هەورەوە خۆی دەشارێتەوە، تاکو نەیبینێت)!

ئه‌ی عاشقی شه‌یدا! به‌ چ مافێك "خۆر" شه‌رمه‌زار ده‌كه‌یت، كه‌ لاپه‌ڕه‌یه‌كی هێنده‌ نوورانی‌یه‌ هه‌شت ناوی مه‌زنی خوای گه‌وره‌ ده‌رده‌خات؟!

پاشان ئه‌وه‌ش هه‌یه‌ كه‌ "شه‌فه‌قه‌ت" بێگه‌رده‌ و هیچ خواستێكی له‌ شه‌فه‌قه‌ت پێدا هاتووه‌كه‌ ناوێت! كه‌واته‌ خاوێنه‌ و داوای پاداشت ناكات. به‌ڵگه‌ش له‌سه‌ر ئه‌مه‌: شه‌فه‌قه‌تی دایكانی گیانله‌به‌رانه‌ كه‌ ئاوێته‌ی خۆبه‌خت كردنه‌ و له‌ نزمترین پله‌ی شه‌فه‌قه‌تدایه‌، چونكه‌ هیچ شتێكی له‌ به‌رامبه‌ر شه‌فه‌قه‌ته‌كه‌یه‌وه‌ ناوێت..

كه‌چی "عیشق" پاداشتی ده‌وێ.. گریه‌ و زاریی عاشقان جۆرێكه‌ له‌و داواكاریی حه‌ق و پاداشته‌!

كه‌واته‌ شه‌فه‌قه‌تی حه‌زره‌تی یه‌عقووب - درورودی له‌سه‌ر بێت - كه‌ دره‌خشانترین نووره‌ له‌ دره‌خشانترین سووره‌تی قورئان (سووره‌تی یووسف)دا، هه‌ردوو ناوی جوانی: "الرحمن الرحیم" ده‌رده‌خات و ڕایده‌گه‌یه‌نێت كه‌:

"شه‌فه‌قه‌ت" ڕێگای به‌زه‌یی و میهره‌بانی‌یه‌.

ئنجا چاره‌سه‌ری ئازاری ئه‌و شه‌فه‌قه‌ته‌ش بریتی‌یه‌ له‌:

﴿فالله خيرٌ حافظاً وهو أرحمُ الراحمين﴾! (يوسف:٦٤).

الباقي هو الباقي

**سه‌عیدی نوورسی**

# مزگێنی‌یەكانی تەوحید

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

(لا إله إلا الله، وحده، لا شريك له، له الملك، وله الحمد، يحيي، ويميت، وهو حي لا يموت، بيده الخير، وهو على كل شيء قدير، وإليه المصير)[1].

(ئەم ڕستەیە كە پوختەی تەوحیدە، بریتی‌یە لە یازدە وشە و، خوێندنی لە پاش نوێژی بەیانی و شێوان گەلێ بەهرە و سوودی زۆری تێدایە، بە ڕادەیەك كە ڕیوایەتێكی صەحیح ئەم ڕستەیەی لە پلەی "ئیسمی ئەعزەم"دا داناوە. كەواتە بەلاتەوە سەیر نەبێت كە هەموو وشەیەكی ئەم ڕستەیە ئومێدێكی شیفابەخش و مزگێنی‌یەكی دڵخۆشكەری لێ بچۆڕێت و، دارای پلەیەكی مەزن بێت لە پلەكانی "تەوحیدی پەروەردگاری" و، لە گۆشەی "ئیسمی ئەعزەم"یشەوە: مەزنیی یەكتایی و.. تەواوەتیی تەوحید، ڕوون بكاتەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئەم ڕاستی‌یە فراوان و بەرزانە بە تەواوی لە "وتەكان"دا ڕوون كراونەتەوە، ئەوا خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەوێ دەكەین. بەڵام لێرەدا، لەبەر بەڵێنێكی پێشینە، لە شێوەی پوختەیەكی زۆر كورتدا و، بە پێشەكی‌یەك و دوو مەقام، پێڕستێك بۆ ئەم ڕستەیە دادەنێین).

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأبو داود والنسائي وأحمد والطبراني وابن خزيمة.

ئیعتیباریی ناحه‌قیقی بۆ وه‌سف و حاڵه‌ته‌كانی زانایانی فه‌رمانگه‌ی كاروباری ئایینی له‌ ناوه‌ندی كارمه‌ندانی فه‌رمانگه‌ی دادگه‌ریدا ده‌رده‌كه‌وێت..

واته‌ ئه‌و كاته‌ ده‌بێ ته‌سه‌ووری سیفه‌تێكی سێبه‌رئاسا و شوێنكه‌وته‌ بۆ فه‌رمانگه‌ی كاروباری ئایینی بكرێت له‌ ناوه‌ندی كارمه‌ندانی فه‌رمانگه‌ی دادگه‌ریدا. حاڵی فه‌رمانگه‌ی سه‌ربازیش به‌ هه‌مان جۆره‌، چونكه‌ ئه‌و كاته‌ ده‌بێ كاروبار و مامه‌ڵه‌كانی ئه‌م فه‌رمانگه‌یه‌ به‌ شێوه‌یه‌كی سێبه‌ر ئاسا و گریمان و ناحه‌قیقی له‌ ناوه‌ندی كارمه‌ندانی فه‌رمانگه‌ی دادگه‌ریدا ده‌ربكه‌وێت.. فه‌رمانگه‌كانی تریش به‌ هه‌مان جۆر..

كه‌واته‌ له‌م حاڵه‌ته‌دا ته‌نها ناوی "فه‌رمانڕه‌وای دادگه‌ر" و سیفه‌تی فه‌رمانڕه‌وایه‌كه‌ی له‌ فه‌رمانگه‌ی دادگه‌ریدا، به‌ "ناو" و "سیفه‌ت"ی ڕاسته‌قینه‌ی پادشا ده‌رده‌كه‌وێت و.. ناوه‌كانی تری وه‌ك: "خه‌لیفه‌" و "سه‌ركرده‌ی گشتیی سوپا" و... هتد، به‌ نیسبی و ناحه‌قیقی ده‌مێننه‌وه‌. كه‌چی له‌ ڕاستیدا ماهیه‌تی پادشا و حه‌قیقه‌تی پادشاییه‌كه‌ی داخوازی سه‌رجه‌می ئه‌و ناوانه‌ن به‌ شێوه‌یه‌كی ڕاسته‌قینه‌ و، ئنجا ئه‌و ناوانه‌ش داواكار و داخوازی ئه‌وه‌ن كه‌ ئه‌وانیش فه‌رمانگه‌ی ڕاسته‌قینه‌ی خۆیان ببێت.

هه‌ر به‌م جۆره‌ش، په‌روه‌ردگارێتیی خوای گه‌وره‌ داخوازی بوونی چه‌ندین ناوی جوانی ڕاسته‌قینه‌یه‌، وه‌ك: "الرحمن، الرزاق، الوهاب، الخلاق، الفعال، الكريم، الرحيم". ئه‌م سیفه‌ت و ناوانه‌ش به‌ هه‌مان جۆر داخوازی بوونی چه‌ند ئاوێنه‌یه‌كی ڕاسته‌قینه‌ن تاكو تیایاندا ده‌ربكه‌ون و بدره‌وشێنه‌وه‌.

جا مادەم ڕێڕه‌وانی ڕێبازی "وحدة الوجود"ده‌ڵێن: "لاموجود إلا هو"، به‌مه‌ش سه‌رجه‌می "بوونه‌وه‌ران" داده‌گرنه‌ پله‌ی "ئه‌ندێشه‌" و "عه‌ده‌م"، ئه‌وا

هەر تەنها ئەو ناوانەی خوای گەورە چەشنی: "واجب الوجود، الموجود، الاحد، الواحد" لەبەر چاویاندا بە جۆرێکی ڕاستەقینە دەردەکەون و لەناو فەرمانگەکانیاندا بە چەشنێکی ڕاستەقینە دەدرەوشێنەوە. تەنانەت گەر فەرمانگە و ئاوێنەکانی ئەم ناوانە حەقیقی و ڕاستەقینەش نەبن - بەڵکو عەدەمی و ئەندێشەیی بن - هیچ زیانێك لەو ناوانە نادات، بگرە لەوانەیە وجوودە حەقیقی‌یەکە خاوێنتر و بریسکەدارتر دەربکەوێت گەر ڕەنگی وجوود لە ئاوێنەکەیدا نەبێت..

بەڵام لەم حاڵەتەدا ناوە جوانەکانی تری چەشنی: "الرحمن، الرزاق، القهار، الجبار، الخلاق" دەرکەوتن و درەوشانەوەی ڕاستەقینەیان نابێت، بەڵکو دەبن بە چەند ناوێکی ئیعتیباری و نیسبی. لە کاتێکدا کە ئەم ناوانەش کتومت وەك ناوی: "الموجود" حەقیقی و ڕاستەقینە و ڕەسەنن و، هەرگیز ناکرێت سێبەر و شوێنکەوتە بن.

جا هاوەڵە بەڕێزەکان و موجتەهیدان و پێشەوایانی ئالی بەیت - خوایان لێ ڕازی بێت - کاتێ ئاماژە بۆ دەستووری: "حقائق الأشياء ثابتة" دەکەن، دان بەوەدا دەنێن کە ناوە جوانەکانی خوای گەورە خاوەنی درەوشانەوەی ڕاستەقینەن و، هەموو شتانی مەوجوودیش دارای "بوون"ێکن کە خوای گەورە لە ڕێی بەدیهێنانیانەوە پێی بەخشیون. خۆ هەرچەندە ئەم "بوون"ە لەچاو "بوون"ی خواوەندی "واجب الوجود"دا بە سێبەر و بوونێکی لاوەکی و لاواز دادەنرێت، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا "بوون"ێکی وەهمی و ئەندێشەیی نی‌یە، چونکە خواوەند خۆی لە ڕێی درەوشانەوەی ناوی "الخلاق"ی خۆیەوە سیفەتی "بوون"ی بە شتانی ناو بوونەوەر بەخشیوە و هەر خۆیشی درێژە بە بوونیان دەدات.

نموونه‌ی دووهه‌م:

با وا دابنێین كه‌ هه‌ر چوار دیواری ئه‌م ژووره‌مان چوار ئاوێنه‌ی گه‌وره‌یان له‌سه‌ر قایم كرابێت. كه‌واته‌ وێنه‌ی ژووره‌كه‌ له‌سه‌ر هه‌موو یه‌كێكی ئاوێنه‌كان ده‌رده‌كه‌وێت. به‌ڵام ئه‌وه‌نده‌ هه‌یه‌ كه‌ هه‌ر یه‌ك له‌م ئاوێنانه‌ به‌و شێوه‌یه‌ی كه‌ له‌گه‌ڵ ڕه‌نگ و سیفه‌تی خۆیدا بگونجێت وێنه‌كان ده‌رده‌خات. واته‌ هه‌ر یه‌كه‌یان دیمه‌نێكی تایبه‌تیی ژووره‌كه‌ پیشان ده‌دات..

جا ئه‌گه‌ر دوو پیاو ڕۆشتنه‌ ناو ژووره‌كه‌وه‌ و یه‌كێكیان چاوی به‌ یه‌كێك له‌م چوار ئاوێنه‌یه‌ كه‌وت، ئه‌وا له‌و باوه‌ڕه‌دا ده‌بێت كه‌: هه‌رچی شتی ناو ژووره‌كه‌یه‌ له‌ ئاوێنه‌كه‌یدا ده‌ركه‌وتووه‌. خۆ كاتێ كه‌ ده‌بیستێت ئاوێنه‌ی تر له‌ ژووره‌كه‌دا هه‌یه‌ و ئه‌وانیش وێنه‌ی شتانی ناو ژووره‌كه‌ پیشان ده‌ده‌ن، پێی وا ده‌بێت كه‌ ئه‌وانه‌ وێنه‌ی ئه‌و ئاوێنه‌ بچووكانه‌ن كه‌ به‌ بچووكی له‌ ئاوێنه‌كه‌ی خۆیدا ده‌رده‌كه‌ون و جێگایه‌كی كه‌میان تێدا گرتووه‌، دوای ئه‌وه‌ی كه‌ دوو جار بچووك بوونه‌ته‌وه‌ و حه‌قیقه‌ته‌كه‌یان گۆڕانی به‌سه‌ردا هاتووه‌! بۆیه‌ ده‌ڵێت:

– من وێنه‌كه‌ به‌م جۆره‌ ده‌بینم، كه‌واته‌ حه‌قیقه‌ت ئه‌مه‌یه‌ كه‌ من ده‌یبینم!

به‌ڵام پیاوی دووهه‌م پێی ده‌ڵێت:

– به‌ڵێ وایه‌، تۆ وا ده‌بینیت و بینینه‌كه‌شت ڕاسته‌. به‌ڵام له‌ واقیعدا ئه‌وه‌ی تۆ ده‌یبینیت وێنه‌ی خودی حه‌قیقه‌ته‌كه‌ نی‌یه‌، چونكه‌ جگه‌ له‌و ئاوێنه‌یه‌ی كه‌ تۆ تیایدا ده‌ڕوانیت چه‌ند ئاوێنه‌یه‌كی تریش هه‌یه‌ و، ئه‌وانیش بچووك و ڕه‌نگدانه‌وه‌ی سێبه‌ره‌كان نین وه‌ك تۆ له‌ ئاوێنه‌كه‌تدا ده‌یانبینیت.

به‌ وێنه‌ی ئه‌م نموونه‌یه‌، هه‌موو یه‌كێك له‌ ناوه‌ جوانه‌كانی خوای گه‌وره‌ش داخوازی ئاوێنه‌ی سه‌ربه‌خۆی خۆیانن. بۆ نموونه‌: مادام ناوه‌ جوانه‌كانی:

"الرحمن، الرزاق" دوو ناوی ڕەسەن و حەقیقین، ئەوا داخوازی "بوون"ی بوونەوەرانێکن کە شایستەی ئەوان بن و موحتاجی ئەم چەشنە ڕۆزی و میهرەبانی‌یە بن.

جا هەروەك ناوی "الرحمن" داخوازی چەند بەدیهاتوویەکی زیندووی ئەوتۆیە کە لە جیهانێکی ڕاستەقینەدا پێویستیان بە ڕۆزی بێت، ناوی "الرحیم"یش داخوازی بوونی بەهەشتێکی ڕاستەقینەیە.

لەبەر ئەمانە، دانانی تەنها چەند ناوێکی دیاری کراوی چەشنی: "الموجود، الواحد، الاحد، واجب الوجود" بە ناوی ڕاستەقینە و، وەهەم کردنی ئەوەی کە ناوەکانی تر سێبەر و شوێنکەوتەی ئەوانە بن، بڕیارێکی دادپەروەرانە نی‌یە و، لادانە لە واجبی ڕێزنانی پێویست لەم ناوە جوانانە.

کەواتە ڕاستە شەقام، بەڵکو ڕێی "ویلایەتی کوبرا" هەر تەنها ڕێی هاوەڵە بەڕێزەکان و ئەصفیا و تابیعین و پێشەوایانی ئالی بەیت و پێشەوا موجتەهیدەکانە، خوایان لێ ڕازی بێت. کە ڕێیەکە دەستەی یەکەمی قوتابیانی قورئانی پیرۆز گرتوویانەتەبەر.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ ما عَلَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيم﴾.

﴿رَبَّنا لا تُزِغْ قُلُوبَنا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنا وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّاب﴾.

اللّهم صلّ على مَن أرسلتَه رحمةً للعالمين وعلى آله وصحبه أجمعين.

□ **مەسەلەی سێهەم:**

بریتی‌یە لەو مەسەلە گرنگەی کە هەرگیز ناگونجێ بە "ژیری" شی بکرێتەوە و، بە حیکمەت و فەلسەفەش ناتوانرێت دەربخرێت.

خوای گه‌وره فه‌رموویه‌تی:

﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ (الرحمن:۲۹).

﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾ (البروج:۱٦).

**پرسیار:**

نهێنی و حیكمه‌تی ئه‌م كارایی(فعالیـــة)یه چییه كه مرۆڤ سه‌رسام ده‌كات و له‌م گه‌ردوونه‌دا ده‌ست به‌كاره؟ بۆچی ئه‌م بوونه‌وه‌ره هه‌میشه بزۆكانه هیچ كات له جووڵه ناوه‌ستن، به‌ڵكو به‌رده‌وام ده‌گۆڕێن و نوێ ده‌بنه‌وه؟

**وه‌ڵام:**

ڕوونكردنه‌وه‌ی ئه‌م دانسته هه‌زار لاپه‌ڕه‌ی ده‌وێت. بۆیه ئێستا ئه‌و ڕوونكردنه‌وه‌یه ده‌خه‌ینه لاوه و، وه‌ڵامه‌كه‌ی به‌وپه‌ڕی پوختی له دوو لاپه‌ڕه‌دا جێ ده‌كه‌ینه‌وه و ده‌ڵێین:

هه‌ركه‌سێك ئه‌ركێكی سروشتی ئه‌نجام بدات یان كارێكی گرنگی كۆمه‌ڵایه‌تی جێبه‌جێ بكات و بۆ ئه‌نجامدانی ئه‌و كاره هه‌وڵێكی سه‌رومڕ بدات، ئه‌وا بێ گومان هه‌ركه‌سێك ببینێت هه‌ست ده‌كات كه ئه‌نجامده‌ری ئه‌و كاره له‌به‌ر دوو هانده‌ر كاره‌كه‌ی ڕاده‌په‌ڕێنێت:

یه‌كه‌م: له‌به‌ر ئه‌و به‌رژه‌وه‌ندی و به‌روبووم و سوودانه‌ی كه ئه‌نجامی جێبه‌جێ كردنی ئه‌و ئه‌رك و كارمه‌ندییه‌ن و پێیان ده‌وترێ: "عیلله‌تی غائی".

دووهه‌م: مرۆڤ له ده‌می ئه‌نجامدانی ئه‌و ئه‌ركه‌دا هه‌ست به خۆشویستن و شه‌وق و له‌زه‌تێك ده‌كات و، ئه‌مانه‌ش هانی ده‌ده‌ن كه به گه‌رموگوڕی و

شەوقەوە کارەکەی ڕاپەڕێنێت. ئەمەیان پێی دەوترێت: "داواکار و داخواز"(الداعي والمقتضي).

"خواردن" نموونەیەکە بۆ ئەمە.. ئەوەتا "خواردن": کارمەندی و ئەرکێکی سروشتییە و، مرۆڤ بە هاندەری چێژ و لەزەتی ئیشتیهای خواردن و، بە شەوق و تاسەوە حەز دەکات ئەنجامی بدات. ئنجا دوای ئەنجامدانی ئەم کارە، گەشە کردنی لەش و بەردەوامبوونی ژیانیش - وەك ئەنجام و بەروبوومێکی ئەو خواردنە - پەیدا دەبێت.

سەبارەت بە خوای گەورەش - ولله المثل الأعلى - ئەوا ئەو کارایییەی کە لەم گەردوونە فراوانەدا دەست بەکارە و دڵی مرۆڤ سەرسام و ژیریشی گرفتاری سەرسووڕمان و حەپەسان دەکات، پاڵی بە دوو بەشی ناوەکانی خواوەندەوە داوە و، لە ئەنجامی دەرخستنی دوو حیکمەتی فراوانەوە جێبەجێ دەبن کە هەریەکەیان هێندە فراوانن سنوورێك نییە دیاری و دەستنیشانیان بکات.

**حیکمەتی یەکەم:**

"ناوە جوانەکانی خوای گەورە" گەلێ درەوشانەوەی بێ ژمارە و بێ سنووریان هەیە، چونکە جۆراوجۆریی لە ڕادەبەدەری بەدیهاتووان ئەنجامی جۆراوجۆریی ئەو درەوشانەوە بێ سنوورانەیە.

واتە ئەو ناوە جوانانە داخوازی ئەوەن کە درەوشانەوەی جوانییەکەیان لە ئاوێنەی نەخش و نیگارەکانیاندا ببینن و پیشانی غەیری خۆشیانی بدەن. بەو واتایەی کە ئەو ناوە جوانانە داخوازی نوێ بوونەوەی کتێبی گەردوونن، واتە نوێ بوونەوەی دەم بە دەم و چرکە بە چرکەی ئەو بوونەوەرانە بە بەردەوامی و بێ ڕاوەستان.

به‌ واتايه‌كى تر: ئه‌و ناوانه‌ داخوازى ئه‌وه‌ن كه‌ بوونه‌وه‌ران سه‌رله‌نوێ و هه‌ميشه‌ به‌ نووسينێكى ڕه‌وان و دانا و پڕ له‌ واتاى ورد، بنووسرێنه‌وه‌، به‌ چه‌شنێكى ئه‌وتۆ كه‌ هه‌موو يه‌كێ له‌و نووسراوانه‌ خۆى له‌ پێش چاوى به‌ديهێنه‌ره‌كه‌يدا و له‌ به‌رچاوى بوونه‌وه‌ره‌ خاوه‌ن هه‌ست و شعووره‌كانيشدا ده‌ربخات و هانيان بدات بۆ خوێندنه‌وه‌ى.

**هۆكار و حيكمه‌تى دووهه‌م:**

هه‌روه‌ك كارايى ناو سه‌رجه‌مى بوونه‌وه‌ران له‌ سه‌رچاوه‌ى له‌زه‌ت و ئيشتيها و شه‌وقێكه‌وه‌ هه‌ڵقوڵاوه‌، ته‌نانه‌ت هه‌موو كاراييه‌ك له‌زه‌تێكى تێدايه‌، ته‌نانه‌ت هه‌ريه‌ك له‌و كاراييانه‌ - خۆى له‌ خۆيدا - جۆرێكه‌ له‌ جۆره‌كانى چێژ و له‌زه‌ت..

سه‌باره‌ت به‌ خواوه‌نديش - ولله المثل الأعلى - شه‌فه‌قه‌ت و مه‌حه‌به‌تێكى موقه‌دده‌س و ڕه‌هاى واى هه‌يه‌ كه‌ شايانى خواوه‌ند بن و له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌مه‌ندى و به‌رز و بڵندى و خاوێنى و كه‌ماڵى ئه‌ودا بگونجێن و شايانى بن.. پاشان شه‌وقێكى ڕه‌ها و موقه‌دده‌سيشى هه‌يه‌ كه‌ له‌و شه‌فه‌قه‌ت و مه‌حه‌به‌ته‌وه‌ هاتووه‌.. ئنجا شادمانى‌يه‌كى موقه‌دده‌سى هه‌يه‌ كه‌ له‌و شه‌وقه‌ موقه‌دده‌سه‌وه‌ سه‌رچاوه‌ى گرتووه‌ و.. له‌زه‌تێكى موقه‌دده‌س و شايانيشى هه‌يه‌ - گه‌ر ئه‌م ته‌عبيره‌ دروست بێت - كه‌ له‌و شادمانى‌يه‌ موقه‌دده‌سه‌وه‌ په‌يدا بووه‌ و.. پاشان ميهره‌بانى‌يه‌كى ڕه‌هايشى هه‌يه‌ كه‌ له‌و له‌زه‌ته‌ موقه‌دده‌سه‌وه‌ هه‌ڵقوڵاوه‌..

جا هه‌رچى ڕه‌زامه‌نديى گشتى و كه‌ماڵى هه‌مه‌لايه‌نگر - له‌ ناوه‌ندى كارايى توانستدا - له‌ سه‌رجه‌مى بوونه‌وه‌رانه‌وه‌ سه‌رهه‌ڵده‌دات و، ئه‌نجامى كامڵ بوونيان و ده‌رچوونى توانا و لێهاتنيانه‌ له‌ دۆخى "هێز"ه‌وه‌ به‌ره‌و دۆخى

"کار".. هەرچی لەمانەوە پەیدا دەبێت و سەرهەڵدەدات لە: "ڕەزامەندیی موقەددەس" و "شانازیی موقەددەس" - گەر ئەم تەعبیرانە دروست بن - هەموو ئەوانە، بەو شێوەیەی کە شایان و تایبەت بن بە خواوەندی بەخشندەی میهرەبانەوە، داخوازی کارایەکی ڕەها و بێ سنوورن.

جا لەبەر ئەوەی فەلسەفە و زانست پەی بەم حیکمەتە وردە نابەن کە لەم کاراییە دەست بەکارەی ناو بوونەوەردا هەیە، ئەوا، فەیلەسووف و زاناکان دەچن: "سروشت"ی کەڕ و لاڵ و.. "ڕێکەوت"ی کتوکوێر و.. "هۆکار"ە وشك و بێ گیانەکان تێکەڵی ئەم کاراییە بینەرە زانا و دانایە دەکەن. بەو پێیە نەیانتوانی ڕێ بە نووری حەقیقەت ببەن، بەڵکو گەلێ دوور کەوتنەوە و لە ڕێ ترازان.

﴿قُلِ اللّٰهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِم يَلْعَبُون﴾.

﴿رَبَّنا لا تُزِغْ قُلُوبَنا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنا وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّاب﴾.

اللّهم صلّ وسلّم على كاشفِ طلسمِ كائناتك بعدد ذرات الموجودات وعلى آله وصحبه ما دام الأرضُ والسموات.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

بەشێك لە بڕیسکەی بیست و هەشتەم:

## زیانەکانی "وحدة الوجود"

برای ئازیزم!

داوای هەندێ ڕوونکردنەوەتان لە بارەی "وحدة الوجود"ەوە کردبوو، لە کاتێکدا کە یەکێك لە بڕیسکەکانی مەکتووبی سی و یەکەم وەڵامێکی تێر و تەسەل و بەهێز و ڕوونی تێدایە سەبارەت بە ڕای محێدینی کوڕی عەرەبی لەم مەسەلەیەدا.

بەڵام لێرەدا هەر هێندە دەڵێین کە:

بەگوێدادان و وتنەوەی مەسەلەی "وحدة الوجود" بە خەڵکی، لەم کاتەی ئێستادا، گەلێ زیانیان پێ دەگەیەنێت. چونکە هەروەك ئەگەر تەشبیهات و نموونە هێنانەوە لە دەستی خەواصەوە دەربچن و بڕۆنە دەستی عەوامەوە، یاخود لە دەستی زانستەوە بکەونە ناو دەستی جەهل و نەزانی، ئەوا وەکو حەقیقەت وەردەگیرێن[1]. "وحدة الوجود" و ڕاستییە بەرزەکانی هاوچەشنیشی بە هەمان جۆرن، چونکە ئەگەر بکەونە نێوان کەسانی عەوامی بێ ئاگا و ئەوانەی باوەڕیان بە "کاریگەریی هۆکارەکان" هەیە، ئەوا ئەم مەسەلەیە لە شێوەی "سروشت"دا وەردەگرن و، سێ زیانی گرنگی لێ دەبێتەوە بۆیان:

---

(١) وەك ئەو دوو مەلائیکەتە مەزنەی کە ناویان "ثور" و "حوت"ە و، بەهۆی نهێنیی تەشبیهەوە لە لای عەوام شێوەی گایەکی مەزن و نەهەنگێکی زەبەلاحیان وەرگرتووە! (دانەر)

○ زیانی یەكەم:

هەرچەند مەشرەبی "وحدة الوجود" لە حوكمی ئینكاری كردنی وجوودی بوونەوەراندایە لە ئاستی وجوودی خوای گەورەدا، بەڵام هەتا بڕواتە نێوان چینی عەوامەوە، ئەوا بەرە بەرە لەو مەبەستە دوور دەكەوێتەوە تا لە بیروبۆچوونی بێ ئاگایانی ئەو چینەدا، بە تایبەت ئەوانەیان كە بیریان بە ماددییات چەپەڵ بووە، هێندە لە مەبەست دەترازێت كە دەیانگەیەنێتە ئینكاریی خوایەتیی خوای گەورە لە ئاستی گەردوون و شتانی ماددیدا!

○ زیانی دووهەم:

مەشرەبی "وحدة الوجود" زۆر بە توندی دەست بە ڕووی پەروەردگارێتیی هەرشتێكی تری غەیری خوای گەورەوە دەنێت و هەڵی دەوەشێنێتەوە، تەنانەت ئینكاریی غەیری خوا دەكات و باوەڕ بە بوونی شتێكی تری جگە لە خوا ناكات و بوونی سەربەخۆ نە بۆ دەروونی بەدخواز و نە بۆ هیچ شتێك دانانێت. بەڵام لەم ڕۆژگارەدا كە چەمكەكانی "سروشت" بەسەر بیروبۆچوونەكانی خەڵكدا زاڵ بوون و، دەروونە بەدخوازەكانیش وەك فیرعەونیان لێ هاتووە، بە تایبەت ئەوانەی كە ئامادەیی ئەوەیان تێدایە "نەفسی خۆیان" لە بریی خوای گەورە بپەرستن، نەخوازەڵا لە سەردەم و كاتێكدا كە لەخۆ بایی بوون و خۆپەرستی فووی تێ كراوە و، تا ڕادەیەكیش خەڵكی بەدیهێنەر و دواڕۆژیان لە بیر چووەتەوە.. بێ گومان باسكردنی "وحدة الوجود" ئا لەم سەردەمەدا و بۆ ئەو جۆرەكەسانە - پەنا بە خوا - دەروونی بەدخوازی ئەوانە لە ڕێ دەترازێنێت. تەنانەت ئەوانە لەم ڕێیەوە هێندە لە خۆیان بایی دەبن كە ئیتر دەروونیان جێی هیچ شتێكی تری تێدا نابێتەوە!

○ زیانی سێهه‌م:

ئه‌م مه‌شره‌به‌ هه‌ندێ بیروبۆچوونی ئه‌وتۆ له‌ مرۆڤدا به‌جێ ده‌هێڵێت كه‌ شایانی "پێویستیی بوون"ی زاتی شكۆمه‌ندی خواوه‌ند نی‌یه‌، كه‌ زاتێكه‌ دووره‌ له‌ ناته‌واوی و ته‌نگی و ئالوگۆڕ و له‌ت‌بوون و جێ گرتن و، ئه‌و شتانه‌ی كه‌ هه‌رگیزاو هه‌رگیز له‌گه‌ڵ ئه‌و خاوێنی‌یه‌ی زاتی خوای گه‌وره‌دا ناگونجێت. بۆیه‌ ئه‌م مه‌شره‌به‌ - به‌م بۆنه‌یه‌وه‌ - ده‌بێت به‌هۆی چه‌ند ته‌ڵقینێكی به‌تاڵ و ناڕه‌وا.

به‌ڵێ، ئه‌و كه‌سه‌ی له‌ باره‌ی"وحدة الوجود"ه‌وه‌ ده‌دوێت، ده‌بێ به‌ هزر و بیری خۆی له‌ زه‌وی‌یه‌وه‌ به‌ره‌و ئاسمانه‌كان به‌رز ببێته‌وه‌ و، سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌ران له‌ پشت سه‌ری خۆیه‌وه‌ به‌جێ بهێڵێت و، ڕوانینی ته‌نها ئاراسته‌ی عه‌رشی بڵند بكات و له‌ حاڵه‌تی نوقم بوون(ئیستیغراق)دا بوونه‌وه‌ران به‌ "نه‌بوو" دابنێت.

ئه‌و كاته‌ به‌ "هێزی ئیمان" ده‌توانێت ببینێت كه‌: هه‌موو شتێك ڕاسته‌وخۆ له‌ خواوه‌ندی تاك و ته‌نیاوه‌یه‌.

ده‌نا ئه‌و كه‌سه‌ی له‌ پشتی ئه‌م بوونه‌وه‌رانه‌وه‌ ڕاوه‌ستاوه‌ و له‌وێوه‌ بۆیان ده‌ڕوانێت و، هۆكاره‌كان له‌ به‌رده‌می خۆیدا ده‌بینێت و، له‌ زه‌وی‌یه‌وه‌ ته‌ماشا ده‌كات. له‌وانه‌یه‌ له‌ "كاریگه‌ریی هۆكاره‌كان"دا نوقم ببێت و بكه‌وێته‌ ناو زه‌لكاوی "سروشت"ه‌وه‌.

به‌ڵام ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ وه‌ك جه‌لاله‌ددینی ڕۆمی[1] به‌ فیكر و بیر بۆ عه‌رشی

---

(١) مه‌ولانا جه‌لاله‌ددینی ڕۆمی له‌ شاری (به‌لەخ) له‌ دایك بووه‌ و له‌ شاری (قۆنیه‌)ش كۆچی دوایی كردووه‌. له‌ نێوان ساڵه‌كانی: (٦٠٤-٦٧٢ك/ ١٢٠٧-١٢٧٣ز)دا ژیاوه‌. له‌ فیقهی حه‌نه‌فی و سه‌رجه‌می زانسته‌كانی ڕۆژگاری خۆیدا زانایه‌كی به‌ناوبانگ و به‌توانا بووه‌ و، دوای

مەزن سەردەکەوێت، دەتوانێ بڵێت: "گوێ ڕابگرە و دەرگای بیستنت بکەرەوە، چونکە ئەو شتەی کە لە حەق تەعالا دەیبیستیت، دەشتوانیت لە هەموو کەسێکی ببیستیت"..

دەنا ئەو کەسەی کە نەتوانێت وەك ئەو بۆ ئەم پلە بڵندە بەرز ببێتەوە و، سەرجەم بوونەوەران لە عەرشەوە تا فەرش بە وێنەی چەند ئاوێنەیەك نەبینێت بۆ تیادرەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خواوەند، گەر پێی بڵێیت: "گوێ لە هەموو شتێك ڕابگرە، چونکە گوفتاری خوای لێ دەبیستیت" ئەوا گرفتاری چەندەها بۆچوونی بەتاڵ و ناڕەوا و دژی حەقیقەت دەبێت، وەك ئەوەی لە ناوەرۆك و مەعنادا لە عەرشەوە بەرەو فەرش کەوتبێتە خوارەوە!

﴿قُلِ اللهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾ (الأنعام: ٩١).

ما للتراب ولرب الأرباب؟!

سبحان من تقدس عن الأشباه ذاتُه، وتنــزهت عن مشابــهة الأمثــال صفاتُه، وشهد على ربوبيته آياتُه، جلّ جلالُه ولا إلهَ إلا هو.

**سەعیدی نوورسی**

---

وەفاتی باوکی لە ساڵی (٦٢٨ك)دا لە چوار قوتابخانەی شاری "قۆنیە"دا دەرسی وتووەتەوە. پاشان ڕێبازی تەسەووفی گرتووەتەبەر و (شەمسی تەبریزی) لەم بوارەدا ڕابەریی کردووە. پاشان تەریقەتی "مەولەوی"ی دامەزراندووە. گەلێ بەرهەمی دوای خۆی بەجێهێشتووە، وەك (فیه ما فیه، دیوان کبیر) بەڵام بەناوبانگترینیان (مەسنەویی مەعنەوی)یە کە بیست و شەش هەزار بەیتی شیعرە بە زمانی فارسی و، بۆ چەندین زمانی جیهانی وەرگێڕراوە و بووە بەهۆی بڵاوبوونەوەی ناوبانگی مەولانا لە سەرتاسەری جیهاندا. بۆ زانینی درێژەی ژیانی بڕوانە: (مولانا جلال الدين الرومي في حياته وشعره، تأليف: الدكتور محمد عبدالسلام الكفافي، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧١) هەروەها بەرگی یەکەمی: (رجال الفكر والدعوة في الإسلام) نووسینی خوالێخۆشبوو (السيد أبو الحسن الندوي). (وەرگێڕ)

لە پاشبەندی ئەمیرداغەوە:

## بەڵگەی یەقینی

وەرگرتنی وتەی پیاوانی مەزن، گەر بەڵگەی لەگەڵدا نەبێت، دڵنیایی و بێ گومانی بە دڵی مرۆڤ نابەخشێت، مەگەر لەو کێشەیەدا مرۆڤ خۆش باوەڕی و گومان باشی‌یەکانی زاڵ بن و، لەم ڕێیەوە قەناعەت و متمانەی بۆ دروست ببێت..

بەڵام قەناعەتی ڕاستەقینەی پشت بەستوو بە بەڵگە - وەك لە زانستی مەنتیقدا ڕوون کراوەتەوە - بۆ پلە و پایەی ئەو کەسە ناڕوانێت کە قسەکەی لە زار دەردەچێت، بەڵکو بۆ ئەو بەڵگەیە دەڕوانێت کە ئەوەندە بەهێزە زامدار ناکرێت!

جا هەموو بەڵگەکانی "پەیامەکانی نوور" لەم بەشەن، واتە "بەڵگەی یەقینی"ن. چونکە ئەو حەقیقەتانەی کە ڕێبوارانی ڕێی ویلایەتی سۆفێتی لە ئەنجامی کردار و پەرستن و سلووك و وەرزشی ڕۆحی پێیان دەگەن، هەروەها ئەو ڕاستی‌یانەی ئیمان کە ئەوان لە پشت پەردەوە دەیانبینن، پەیامەکانی نووریش وەك ئەوان دەیانبینن و پێیان دەگەن. بەڵام ئەم پەیامانە ڕێیەکی تریان بۆ ئەمە گرتووەتەبەر..

ئەوەتا لە شوێنی "پەرستش"دا ڕێیەکیان لە ناوەندی "زانست"ەوە بۆ گەیشتن بە حەقیقەت دۆزیوەتەوە و گرتوویانەتەبەر..

لە شوێنی "سلووك و ویردەكان"دا ڕێیەكیان لە ناوەندی "بەڵگە مەنتیقی و زانستی"یەكانەوە لێداوە كە ڕاستەوخۆ مرۆڤ دەگەیەنێتە ڕاستیی هەموو ڕاستییەكان..

لە جێی "تەسەووف و تەریقەت"دا ڕێیەكی ڕاستەوخۆیان بۆ ویلایەتی كوبرا لە بازنەی "زانستی كەلام و عەقیدە و ئوسوولی دین"ەوە دۆزیوەتەوە، كە بە هۆیەوە توانییان بەسەر گومڕاییەكانی فەلسەفەدا سەربكەون.

(ئەو فەلسەفەیەی كە لەم سەردەمەدا بەسەر تەوژمی حەقیقەت و تەریقەتدا سەركەوت).

واقیعیش باشترین شایەتە لەسەر ئەمە!

* * *

شوێنكەوتنی (ڕُهبان) یان (بُرهان)؟!

ئێمەی موسڵمانی خزمەتگوزاری قورئان شوێنی بەڵگە دەكەوین و، بە دڵ و بیر و ژیرمان ڕاستییەكانی ئیمان وەردەگرین. هەرگیز بە وێنەی شوێنكەوتەی ئایینەكەكانی تر نابین، كە دەچن لەبەر چاولێكەریی ڕاهیبەكانیان دەستبەرداری بەڵگەكان دەبن!

**لە (وتاری شام)ەوە**

له بریسکه‌کانه‌وه:

## میانه‌ڕه‌وی له باسی (محێدینی عه‌ره‌بی)دا

ئه‌وه‌نده کاتی پێویستم به ده‌سته‌وه نی‌یه که به‌راوردێك له نێوان بیروبۆچوونه‌کانی هه‌ریه‌ك له: "مسته‌فا صه‌بری"[١] و "مووسا باکۆف"[٢]دا بکه‌م. به‌ڵام هێنده ده‌ڵێم که:

یه‌کێکیان زیاد له پێویست ڕۆچووه و ئه‌وی تریشیان هه‌ندێ حه‌قیقه‌تی پشتگوێ خستووه. چونکه هه‌رچه‌نده "مسته‌فا صه‌بری" له‌چاو "مووسا باکۆف"دا له به‌رگری‌یه‌کانیدا له‌سه‌ر حه‌قه، به‌ڵام مافی شکاندنی که‌سی محێدینی کوڕی عه‌ره‌بیی نی‌یه، که یه‌کێکه له که‌سێتی‌یه ده‌راساکانی زانسته ئیسلامی‌یه‌کان.

به‌ڵێ، محێدینی کوڕی عه‌ره‌بی بۆ خۆی وه‌رگیراوه و له‌سه‌ر ڕێی هیدایه‌ته، به‌ڵام له هه‌موو نووسراوه‌کانیدا ڕابه‌ر و ڕێ نیشانده‌ر و پێشه‌نگ نی‌یه بۆ خه‌ڵکی، چونکه زۆربه‌ی جار به بێ ڕه‌چاوکردنی میزانی ڕاستی‌یه‌کانی

---

(١) مسته‌فا صه‌بری (١٨٦٩-١٩٥٤) شێخولئیسلامی ده‌وڵه‌تی عوسمانی بووه و، به‌ره‌نگاریی بزوتنه‌وه‌ی که‌مالیستی کردووه. پاشان کۆچی کردووه بۆ میسر. گه‌لێ کتێبی داناوه که گرنگترینیان بریتی‌یه له: "موقف العقل و العلم والعالِم من رب العالمين و عباده المرسلين".
(وه‌رگێڕ)

(٢) "مووسا جاروڵڵا باکۆف" تورکستانی و قازانی‌یه و، شێخولئیسلامی ده‌وڵه‌تی ڕووسیای قه‌یسه‌ری بووه. ماوه‌یه‌ك بۆ مه‌به‌ستی ڕزگاربوون له ڕژێمی قه‌یسه‌ری پشتی شۆڕشی به‌لشه‌فیکی گرت، به‌ڵام دوایی ڕاستیی ئه‌و شۆڕشه‌ی بۆ ده‌رکه‌وت و، چه‌ندین جار به‌ند کرا. به زۆر وڵاتدا گه‌ڕاوه و، نزیکه‌ی سه‌د و بیست کتێبی له بابه‌ته جۆراو جۆره‌کانی ئیسلامدا داناوه و، ڕا و بۆچوونه‌کانی ڕووکاری نوێخوازی و سه‌ربه‌ستییان له‌خۆ گرتووه. گرنگترین به‌رهه‌مه‌کانی بریتی‌یه له: "الوشيعة في نقض عقائد الشيعة". له قاهیره کۆچی دوایی کردووه. (وه‌رگێڕ)

شەرع هەنگاو دەنێت و، بە پێچەوانەی قاعیدە و دەستوورەکانی ئەهلی سوننەت ڕەفتار دەکات و، هەندێ لە گوفتارەکانیشی بە ڕواڵەت گومڕایی دەگەیەنێت، هەرچەندەش خۆی لە گومڕایی بەرییە. چونکە هەندێ جار گوفتار لە ڕواڵەتدا بە "کوفر" دەردەکەوێت بەڵام خاوەنەکەی بە "کافر" دانانرێت..

جا "مستەفا صەبری" ئەم خاڵانەی ڕەچاو نەکردووە، بۆیە لە پشتگیریی کردنیدا بۆ قاعیدە و دەستوورەکانی "ئەهلی سوننەت" هەندێ شتی پشتگوێ خستووە و دووچاری "تەفریط" بووە.

بەڵام "مووسا باکۆف" بە بۆنەی ئەو بیروبۆچوونانەی کە شان بە شانی شارستانێتییە و زۆر بە توندی لایەنی نوێخوازی دەگرێت، ئەوا گەلێ جار بە هەڵەدا دەچێت، چونکە هەندێ لە ڕاستییەکانی ئیسلام بە چەند تەئویلێکی هەڵە دەستکاری دەکات و، کەسێکی وەرنەگیراوی وەك "ئەبولعەلای مەعەڕڕی" دەخاتە ئاستێکی بەرزتر لە هی زانایانی لێکۆڵەری ئیسلام و، زیاد لە پێویست لە لایەنگرتنی توندوتیژیدا بۆ ئەو مەسەلانە ڕۆچووە کە محێدینی عەرەبی تیایاندا پێچەوانەی ئەهلی سوننەتی کردووە و، لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی ئەمدا یەکیان گرتووە.

شێخ محێدین خۆی وتوویەتی:

"تحرم مطالعة كتبنا على مَن ليس منا".

واتە: خوێندنەوەی کتێبەکانمان حەرامە لەو کەسانەی شارەزای مەقامی ئێمە نین.

بەڵێ، خوێندنەوەی کتێبەکانی شێخ محێدین، بە تایبەت ئەو مەسەلانەی کە لە "وحدة الوجود" دەدوێن، لەم سەردەمەدا زیانی هەیە.

بریسکەی نۆهەم:

# چەند ناتەواوی‌یەکی ورد لـە (وحـدة الـوجود)دا

**هەموو کەسێك ناتوانێت کەموکوڕی‌یە وردەکانی "وحدة الوجود" ببینێت و پێویستی بەو زانینە نابێت، کەواتە پێویستی بە خوێندنەوەی ئەم "بریسکە"یەش نی‌یە!**

برای ئازیزم!

شێخ محێدینی عەرەبی وتوویەتی:

"إنَّ مخلوقيةَ الروحِ عبارةٌ عن انكشافِها".

برام! تۆ بەم پرسیارەت منی لاوازی کۆڵەوار ناچاری وتووێژ دەکەیت لەگەڵ بلیمەتی "حەقیقەت" و هەڵکەوتووی عیلمی ئەسرار: "محێدینی عەرەبی"دا! بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە باس و لێکۆڵینەوەکەمدا پشت بە دەقەکانی قورئانی پیرۆز دەبەستم، ئەوا دەتوانم لەو هەڵۆیە بەرزتریش بفڕم، هەرچەندە لەخۆمدا وەکو "مێش"ێك وابم!

برام! محێدینی کوڕی عەرەبی خەڵکی ناخەڵەتێنێت، بەڵکو بۆ خۆی دەخەڵەتێت! چونکە هەرچەندە ئەو بۆخۆی لەسەر ڕێی هیدایەتە، بەڵام لە هەموو نووسینەکانیدا هیدایەتدەری غەیری خۆی نی‌یە.. ئەوەی ئەو دیویەتی، ڕاستە بینیویەتی. بەڵام "حەقیقەت" ئەوە نی‌یە کە دیویەتی!

باسـی "ڕۆح" لـە وتـەی بیسـت و نۆهـەمدا ئـەو ڕاسـتی‌یەی ڕوون کردووەتەوە کە پرسیارەکەتانی لەبارەوە کراوە.

بەڵێ، ڕۆح، لە ڕووی ماهییەتەوە، یاسایەکی "ئەمری"یە، بەڵام "بوونی دەرەکی"ی لەبەر کـراوە. کەواتـە یاسـایەکی زینـدووە و خـاوەنی بوونـی دەرەکی(وجود خارجی)یە.

شێخ محێدین کاتێ کە بۆ "ڕۆح"ی ڕوانیوە تەنها لە ڕووی ماهییەتەکەیەوە سەیری کردووە و لە ڕوانگەی مەشرەبی "وحدة الوجود"ەوە پێـی وایە شتان هەموویان "ئەندێشە"ن!

جا لەبـەر ئەوەی "شێخ محێدیـن" ڕێبـازێکی سـەربەخۆی گرتووەتەبەر و، خاوەنی مەشرەبێکی گرنگ و کەشف و بینینی نائاسایی و لە عادەت بـەدەرە، ئەوا هـەندێ جـار لـە ناچـاریدا پـەنا دەباتـە بـەر چـەند تـەئویلێکی لاواز و زۆر لـەخۆکردن، تـاکو هـەندێ ئایەتی قورئـانی پیرۆز لەگـەڵ مەشـرەب و بینینـە کەشـفی‌یەکانی خۆیـدا یـەك بخـات، کـە ئەمـەش "ڕاشـکاوی"ی ئایەتـەکان زامدار دەکات!

ئێمەش لە چەندین پەیامی تردا ڕێبازی ڕاسـت و ڕەوانـی قورئـان و ئـەهلی سوننەتمان لەم ڕووەوە ڕوون کردووەتەوە.

"شێخ محێدین" بـۆ خـۆی خـاوەنی پلـە و پایەیـەکی تایبەتی‌یـە و یەکێکـە لـە وەرگـیراو(مقبـول)ەکـان. بـەڵام بـە کەشـفە دوور لـە قـاعیدە و بـێ دەسـتوورەکانی، سـنووری شـکاندووە و، بڕیارەکـانی لـە زۆر مەسـەلەدا پێچەوانەی بڕیاری جەماوەری زانا لێکۆڵەرەکانە[1].

---

(١) ئەمە تەنها ڕای مامۆستا نوورسـی نی‌یـە سـەبارەت بـە زانستە کەشـفی‌یەکانی شـێخ محێدیـن، بەڵکو ڕای گەلـێ زانـای تریشـە لـە گـەورە مـەردانی ئیسـلام. بۆ نموونـە ئیمـامی ڕەببـانی (شـێخ ئەحـمـەدی فـاروقیی سـەرهەندی) لـەم بارەیـەوە لـە مـە کتووبی (٢٦٦)ی مەکتووباتە کـەیدا

هەر لەبەر ئەوەشە کە تەریقەتە تایبەتی‌یەکەی ئەو تەنها بۆ ماوەیەکی کەم مایەوە و لە "صەدرەددینی قۆنیەیی"[(١)] بەو لاوە زیاتر بڕی نەکرد و بەردەوام نەبوو. ئنجا بە دەگمەن ڕێ دەکەوێت سوودێکی بە ئیستیقامەت و ڕاست و ڕەوا لە بەرهەمەکانی وەربگیرێت، هەرچەندەش خۆی لە خۆیدا شێخێکی مەزن و پلە بەرز و قوتبێکی هەڵکەوتووی بێ وێنەی زەمانی خۆیەتی. ئەوەتا زۆربەی زانایانی ئەصفیا و لێکۆڵەر خەڵکی بۆ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی هان نادەن، تەنانەت هەندێکیشیان خەڵکی لێ قەدەغە دەکەن.

ڕوونکردنەوەی جیاوازیی سەرەکیی نێوان مەشرەبی شێخ محێدین و مەشرەبی زانایانی لێکۆڵەر، پاشان باسکردنی سەرچاوەی هەردوو لایان، لە ڕاستیدا پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی وردی خەستوخۆڵ و تاوتوێ کردنێکی بەرز و فراوان هەیە.

بەڵێ، جیاوازی‌یەکەی نێوان هەردوو لا گەلێ ورد و قووڵە و، سەرچاوەکەش هێندە بەرز و بڵندە کە شێخ لەسەر هەڵەکەی تاوانبار نەکراوە و هەر بە مەقبوولی لە لای زانایان ماوەتەوە. چونکە ئەگەر ئەو

---

دەفەرموێ: (زۆربەی زانستە کەشفی‌یەکانی ئەو [ شێخ محێدین ] کە پێچەوانەی زانستەکانی ئەهلی سوننەتن، لە ڕاستی‌یەوە دوورن و، مەگەر مرۆڤێکی نەخۆش یان کەسێکی تەواو چاولێکەر، دەنا کەس شوێنی ئەو کەشفیاتانە ناکەوێت). بڕوانە: چاپە فارسی‌یە تازەکەی (مکتوبات امام ربانی)١/٥٨٥ انتشارات صدیقی – زاهدان ١٤٢٥هـ، یان چاپە عەرەبی‌یەکە ٢٧٧/١ دار الكتب العلمية – بيروت. (وەرگێڕ)

(١) صەدرەددین: ناوی محەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی محەممەدی کوڕی یووسفی قۆنیەیی ڕۆمی‌یە. لە گەورە قوتابی و موریدانی شێخ محێدینە. چەند بەرهەمێکی هەیە، وەك: "النصوص في تحقيق الطور المخصوص"، "إعجاز البيان في تفسير أم القرآن". بڕوانە: الأعلام ٣٠/٦، طبقات المفسرين ١٠٣/٢، تذكرة الحفاظ للذهبي ١٤٩١، طبقات الأولياء ٤٦٧، الطبقات الكبرى للشعراني ٢٠٢/١. (وەرگێڕ – لە چاپی عەرەبیی "اللمعات"ەوە)

جیاوازی‌یە و سەرچاوەکەی، بە "بیر و زانیاری و کەشف" ئاشکرا و بینراو بوونایە، ئەوا ئەو مەشرەب و ڕێبازە بە تێکشکانێکی سامناك و هەڵەیەکی گەورە بۆ شێخ لە قەڵەم دەدرا.

جا لەبەر ئەوەی جیاوازی‌یەکە تەواو ورد و قووڵە، ئەوا هەوڵ دەدەین کە هەڵەی شێخ تەنها لەو مەسەلەیەدا دەربخەین و، ئەو جیاوازی و سەرچاوانە لە نموونەیەکی تەواو پوختدا ڕوون بکەینەوە.

بو نموونە:

"خۆر" لەناو ئاوێنەدا دەردەکەوێت. کەواتە ئەم ئاوێنەیە "مەظرووف" و "مەوصووف"ی خۆرە. بەو واتایەی کە لە ڕوویەکەوە "خۆر" لەو ئاوێنەیەدا هەیە و، لە ڕوویەکی تریشەوە ئاوێنەکەی ڕازاندووەتەوە بە ڕادەیەك کە بووە بە سیفەتی تیشکدەر و دەرخەری ئاوێنەکە.

خۆ ئەگەر ئەو ئاوێنەیە ئاوێنەی کامێرای وێنەگرتن بێت، ئەوا وێنەی خۆر - بە شێوەیەکی چەسپاو - دەگوێزرێتەوە بۆ سەر کاغەزێکی ناسکی تایبەتی.. جا لەم حاڵەتەدا، چ ئەو خۆرەی کە لە ئاوێنەکەدا دەبینرێت و، چ ماهییەت و سیفەتەکەشی کە لەسەر کاغەزەکە وێنەی گیراوە و، چ ڕازاندنەوەی ئاوێنەکەش بەو خۆرە کە لە ڕادەیەکدایە دەڵێی "خۆر" بووە بە سیفەتی ئەو ئاوێنەیە.. ئەم خۆرە، لەم حاڵەتەدا، غەیری خۆرە ڕاستەقینەکەیە، چونکە ئەوە خودی "خۆر" نی‌یە، بەڵکو بریتی‌یە لەوەی کە "درەوشانەوەی خۆر" ڕۆشتووەتە ناو "وجوود"ێکی ترەوە!

خۆ هەرچەندەش بوونی ئەو خۆرەی کە لە ئاوێنەکەدا دەبینرێت خودی ئەو خۆرە ڕاستەقینەیەی دەرەوە نی‌یە، کەچی لەبەر پەیوەندیی بەو خۆرەی دەرەوە و ئاماژەکردنی بۆی، وا گومان براوە کە خودی ئەو بێت!

جا لەسەر بناغەی ئەم نموونەیە:

ئەگەر بوترێ: "جگە لە خۆری ڕاستەقینە هیچی تر لـە ئاوێنەکەدا نییـە"، دەکرێ ڕاست بێت، گەر مەبەست پێـی ئـەوە بێـت کـە ئاوێنەکـە "زەرف"ە و مەبەستیش بە خۆرەکەی ناوی بوونە دەرەکییەکەی بێت .

بەڵام گەر بوترێ:

"وێنـەی ئـەو خـۆرەی کـە لەسـەر ئاوێنەکـە دیـارە و حوکمـی سـیفەتی ئاوێنەکـەی وەرگرتـووە.. هـەروەها ئـەو وێنەیـەش کـە ڕۆشـتووەتە سـەر کاغەزەکە: خودی خۆرە".. دیارە ئەمە هەڵەیە.

واتە دەستەواژەی: "خۆر جگـە لـەناو ئاوێنەکە لـەناو هیچی تـردا نییـە" دەستەواژەیەکی هەڵە دەبێت. چونکە ئەوەتا وێنەیەکی خـۆر لەسەر ئاوێنەکە دەردەکەوێت و، وێنەیەکی تریشی هەیە کە لـە پشـت ئاوێنەکـەوە لەسـەر کاغەزەکە دەرکەوتووە و، هەریەکەیان خاوەنی "وجوود"ێکی تایبەتـە بـە خۆیەوە. خۆ هەرچەندەش ئەم دوو "وجوود"ە لـە درەوشـانەوەی خـۆرەوە سەرچاوەیان گرتووە، کەچی هیچیان خودی "خۆر" نین!

"زەین" و "ئەندێشە"ی مرۆڤیش وەك ئەم نموونەی ئاوێنەیە وان، چونکە:

ئەو زانیارییانەی کە لە ئاوێنـەی "بیر"ی مرۆڤدان، ئەوانیش دوو ڕوویـان هەیە. ئەوەتا لە ڕوویەکەوە "زانین"ن و، لە ڕوویەکی تریشەوە "زانراو"ن!

جا ئەگەر "زەین" بە دەفری ئەو زانراوە دابنێین، ئەوا ئەو شتە (مەوجوودە، زانـراوە) دەبێـت بـە زانراوێکـی زیـهنی، کەواتـە وجـودی خـۆی وجودێکـی جیاوازە..

بەڵام گـەر وا دابنێین کـە"زەیـن"بـووە بـە مەوسـووفی ئـەو شتەی چووەتـە ناویەوە و بووەتە سیفەتی زەین، ئـەوا بـە "زانـین" دادەنرێـت و خـاوەنی بوونـی

دەرەکـی دەبێـت. تەنانـەت گـەر ئـەو شـتە زانـراوە خـاوەن "وجـوود" و "جەوهەر"یش بێت ئەوا هەر وجوودێکی خاریجیی لاوەکی دەبێت.

جا لەسەر بناغەی ئەم دوو نموونەیە:

"گـەردوون" ئاوێنەیـە.. "ماهییـەت"ی هـەموو مـەوجوودێك، بـە هـەمان جۆر، ئاوێنەیە..

ئەم ئاوێنانەش خوای گەورە بە توانستی ئەزەلیی خۆی بەدییان دەهێنێـت و "بوون"یان پێ دەبەخشێت.

کەواتە هەموو مەوجوودێك – لە ڕوویەکەوە – دەبێت بە ئاوێنە بۆ یەکێك لـە نـاوە جوانـەکانی خواوەنـد و، یەکێك لــە نەخشـونیگارەکانی ئـەو نـاوە دەردەخات.

جا ئەو کەسـانەی کـە لەسـەر مەشرەبی "شێخ محێدیـن"ن، جیـهانیان لـەو ڕووەوە بۆ دەرکەوتووە کە "ئاوێنە" و "دەفر" و "مـەوجوودی میسـالی"ی نـاو ئاوێنەکەیە و، پێیان وایە کە: دانەوەی وێنـەی شـتان لـەناو ئاوێنەکـەدا خـودی ئـەو شتانەیە و، و وتوویانـە: "لا موجـود إلا هـو" بـێ ئـەوەی بـیر لــە پلـەکانی تری"بوون" بکەنەوە. ئیتر لەم ڕێیەوە هێندە کەوتنە هەڵەوە تا گەیشتنە ئەوەی ئینکاریی ئەو دەستوورە بنەڕەتی‌یە بکەن کە دەڵێت: "حقائق الأشياء ثابتة"!

بەڵام ئەهلی حەقیقەت، بەهۆی ئەوەی میراتگری میراتی پێغەمبـەرن ﷺ و، پشتیان بـە دەقـی ڕاشـکاوی قورئـان و ئایەتـە ڕوون و ئاشـکراکانی بەسـتووە، پێیان وایە:

ئەو نەخشونیگارانەی کە بە توانست و ویستی خوای گـەورە لـە ئاوێنـەی بوونەوەراندا هەن، ئاسەواری خوای گـەورەن و، هـەموو "مـەوجوود"ێـك لـە

لایه‌نی خوای گه‌وره‌وه "بوون"ێكی دراوه‌تێ كه‌ هه‌ر ئه‌و خواوه‌نده‌ خۆی به‌دیی هێناوه‌.

ئنجا هیچ مه‌وجوودێكی تر "ئه‌و" نی‌یه‌ تاكو بوترێ: "لا موجود إلا هو"! چونكه‌ شتانی تر خاوه‌نی "بوون"ی خۆیانن و ئه‌م بوونه‌شیان تا ڕاده‌یه‌ك جێگیر و چه‌سپاوه‌. خۆ هه‌رچه‌نده‌ش له‌ چاو بوونی خواوه‌ندا "بوون"ێكی لاوازه‌ و ده‌لێی ئه‌ندێشه‌ و خه‌یاڵه‌، به‌ڵام هه‌رچۆن بێت هه‌ر دارای "بوون"ێكه‌ كه‌ خواوه‌ندی خاوه‌ن توانستی ئه‌زه‌لی، به‌ ویست و توانستی خۆی، پێی به‌خشیوه‌.

ئه‌و "خۆر"ه‌ی كه‌ له‌ناو ئاوێنه‌دا ده‌بینرێت، خاوه‌نی بوونێكی تری جیایه‌، جگه‌ له‌ بوونه‌ ده‌ره‌كی‌یه‌كه‌ی خۆی..

هه‌روه‌ها خاوه‌نی بوونێكی ده‌ره‌كیی لاوه‌كی‌یه‌ كه‌ به‌ ئارایشتی خۆی ئاوێنه‌كه‌ ڕه‌نگ ده‌كات، ئه‌وه‌تا ئاوێنه‌كه‌ ئه‌وی تێدا ده‌رده‌كه‌وێت..

هه‌روه‌ها خاوه‌نی بوونێكی ده‌ره‌كیی لاوه‌كیی تا ڕاده‌یه‌ك چه‌سپاوه‌، كه‌ بریتی‌یه‌ له‌و وێنه‌یه‌ی كه‌ له‌سه‌ر كاغه‌زه‌كه‌ی پشتی ئاوێنه‌كه‌وه‌ نه‌خشێنراوه‌..

جا هه‌روه‌ك خۆر – به‌ وێنه‌ی ئه‌م نموونه‌یه‌ – خاوه‌نی چه‌ندین "بوون"ی ئاوایه‌، به‌ هه‌مان جۆر: ئاوێنه‌ی گه‌ردوون و ئاوێنه‌كانی ماهییه‌تی شتانیش دارای چه‌ندین "بوون"ی وه‌هان. چونكه‌ نه‌خشونیگاری ئه‌و به‌دیهاتووه‌ ڕواڵه‌تییانه‌ی كه‌ به‌ لێ درەوشانه‌وه‌ی ناوه‌ جوانه‌كانی خوای گه‌وره‌ و به‌ ویست و ئیختیار و توانستی خواوه‌ند نه‌خشێنراون، خاوه‌نی "وجوود"ێكی په‌یدابوو(حادث)ی غه‌یری وجوودی خواوه‌ندی "واجب الوجود"ن و، به‌ توانستی خواوه‌ند چه‌سپاوی(الثبات) به‌م وجووده‌ی ئه‌وان به‌خشراوه‌.

بەڵام گەر ئەو پەیوەندی‌یە بپچڕێت، ئەوا شتان هیچیان نامێنن و یەکسەر تیادەچن. کەواتە هەموو شتێك، بۆ مانەوەی خۆی، لە هەموو دەم و ساتێکدا پێویستی بەوەیە کە "بەدیهێنەر"ی بیهێڵێتەوە. چونکە "حەقیقەت"ی شتان هەرچەندەش جێگیر و چەسپاوە، بەڵام ئەم چەسپاوی و جێگیربوونەی لە لایەن زاتی خۆیانەوە نی‌یە، بەڵکو بە چەسپاندن و جێگیرکردنی خواوەند دەستیان دەکەوێت. بەم جۆرە، دەرکەوت کە وتەکەی "شێخ محێدینی عەرەبی":

(ڕۆح بەدیهاتوو نی‌یە، بەڵکو حەقیقەتێکە لە جیهانی "ئەمر" و سیفەتی "ئیرادە"وە هاتووە)، وتەیەکە پێچەوانەی واتای ڕاشکاوی گەلێ دەقی زۆر و زەبەندەیە. هەروەك لە ڕووناکیی ئەو لێکۆڵینەوانەی پێشوودا دەردەکەوێت کە کێشەکەی لێ ئاڵۆزاوە و تیایدا خەڵەتاوە. چونکە "مەوجوود"ە لاوازەکانی نەدیوە!

هەرگیزاوهەرگیز ناکرێ ئەو مەوجوودانەی کە ناوە جوانەکانی چەشنی: "الخلاق، الرزاق"یان تێدا دەردەکەوێت، چەند شتێکی وەهمی و ئەندێشەیی بن! چونکە مادەم ئەو ناوانە هەموویان دارای "حەقیقەت"ن، ئەوا ئەو ئاوێنانەش کە ئەوانیان تێدا دەردەکەون، بە هەمان جۆر، خاوەنی حەقیقەتی دەرەکین.

* * *

## پاشكۆی ئه‌و پرسیاره‌ی كه‌ سه‌باره‌ت به‌ "محیّدینی عه‌ره‌بی" كرا

**پرسیار:**

"ئیبن عه‌ره‌بی" مه‌سه‌له‌ی "وحدة الوجود" به‌ بلندترین پله‌ی "ئیمان" داده‌نێت. ته‌نانه‌ت كه‌سانێكی زۆری ئه‌ولیا مه‌زنه‌كانی ئه‌هلی عیشق له‌و ڕێبازه‌دا شوێنی كه‌وتوون..

كه‌چی تۆ ده‌ڵێیت:

ئه‌م ڕێبازه‌ مه‌زنترین پله‌ی ئیمان و ڕێبازی ڕاسته‌قینه‌ نی‌یه‌، به‌ڵكو مه‌شره‌بێكه‌ هی ئه‌هلی مه‌ستی و ئیستیغراق و شه‌وق و عیشقه‌.

جا ئه‌گه‌ر وایه‌، ئه‌وا به‌ پوختی: به‌رزترین پله‌كانی "ته‌وحید"مان بۆ باس بكه‌، ئه‌وه‌ی كه‌ ڕاشكاویی قورئان و میراتگریی پێغه‌مبه‌رایه‌تی ڕوونیان كردووه‌ته‌وه‌.

**وه‌ڵام:**

كۆڵه‌وارێكی هه‌ژاری وه‌ك من، كه‌ خاوه‌نی هیچ گرنگی و به‌هایه‌ك نی‌یه‌، له‌ كوێ ده‌توانێت خۆی له‌و پله‌ به‌رز و بلندانه‌ بئاڵێنێت و، به‌ عه‌قڵی كورت و كول و كاسی خۆی "داوه‌ریی ژیری"یان تێدا ئه‌نجام بدات! چونكه‌ ئه‌م كاره‌ سه‌د ئه‌وه‌نده‌ له‌ سه‌رووی توانای منه‌وه‌یه‌. به‌ڵام وا زۆر به‌ پوختی دوو سه‌رنج باس ده‌كه‌م كه‌ له‌ ڕێژنه‌ی به‌ره‌كه‌تی قورئانی پیرۆزه‌وه‌ ڕژانه‌ ناو دڵمه‌وه‌، به‌و ئومێده‌ی كه‌ سوودیان تێدا بێت.

سەرنجی یەکەم:

گەلێ هۆکار هەن کە مرۆڤ بەرەو مەشرەبی "وحدة الوجود" کێش دەکەن..

*هۆکاری یەکەم:* ئەوان نەیانتوانی مەزنترین پلەی: "بەدیهێنەریتیی پەروەردگاری"(خلاقیـة الربوبیـة) لە زەینی خۆیاندا جێ بکەنەوە و، لە "دڵ"یشیاندا ئەوە جێگیر بکەن کە: خواوەند - بە تەنیایی خۆی - جڵەوی هەموو شتێکی لە دەستی پەروەردگاریتیی خۆیدا داناوە و، هەموو شتێك بە توانست و ئیختیار و ویستی ئەو بەدی دەهێنرێت..

لەبەر ئەوەی کە ئەوان نەیانتوانی پەی بەمانە ببەن، ئەوا خۆیان بە ناچار زانی کە بڵێن: (هەموو شتێك خوای تەعالایە). یان: (هیچ شتێك - جگە لەو - وجوودی نی‌یە). یان: (بوونەوەران خەیاڵ و ئەندێشەن). یان: (بوونەوەر جۆرێکە لە خۆدەرخستن و جیلوەی ئەو).

*هۆکاری دووهەم:* سیفەتی: "عیشق" بە جۆرێکە هەرگیز "جودایی" ناوێ و لێی هەڵدێت.. مرۆڤی: "عاشق"یش هەردەم لەتاو جودایی و لێکدابڕانی لە خۆشەویستەکەی لەرزی لێ دێت و، چەندە لە دۆزەخ دەترسێت هێندەش لە دوورکەوتنەوەی خۆشەویستەکەی دەترسێت و، بە توندی لە دەست "نەمانی" هەڵدێت.. هەروەها چەندەش زات و ڕۆحی خۆی خۆش دەوێت بەو ئەندازەیەش بە یەك شادبوونی پێ خۆشە و حەزی لێیەتی.. چۆن لە ڕادەبەدەر تاسەمەندی دیداری بەهەشتە، بە هەمان جۆریش موشتاقی نزیکبوونەوەیە لە خوای گەورە..

لەبەر ئەوە، مرۆڤی "عاشق" پێی وایە کە دەستگیرکردن لە داوێنی درەوشانەوەی "ئەقرەبییەتی ئیلاهی" کارێك دەکات "جودایی" و لێك

دوورکەوتنەوە لــە حوکمی "نـەبوو"دا بێـت و، لـەو گومانەدایـە کـە "بە یـەك شادبوون" و "بــە یـەك گەیشتن" هەمیشـەیین، ئەمـەش بـە: "لا موجـود إلاّ هـو" دەردەبڕێت.

جـا لـەبـەر ئـەوەی ئـەو عاشـقانە بەهۆی مەستیی عیشــق و بـە داخوازیـی شەوقی مانەوە و بە یەك شادبوون، پێیان وایە کە "وحدة الوجود" مەشرەبێکی "حـاڵ"ی وەهایـە لەوپـەڕی چێژ و خۆشیدایە، ئەوا بۆ خۆڕزگــار کردن لــە چەندەها جودایی و لێکــبڕانی سامناك داڵــدەی خۆیـان لـە مەسـەلەی "وحـدة الوجود" دا دەبیننەوە.

واتە: سەرچاوەی سەرهەڵدانی هۆکاری یەکەم بریتی‌یە لەوەی کە:

"ژیری"ی ئەوان پەیی بە هـەندێ لـە ڕاستی‌یە یـەکجار بـەرز و بڵندەکـانی "ئیمان" نـەبردووە و نـەیتوانیوە بـە تـەواوی لێیـان تـێ بگـات، هـاودەم لەگـەڵ ئەمەشـدا "ژیـری"یـەکانیان – لـە ڕووی ئیمانـەوە – بـە تـەواوی شتانیان لـــێ دەرنەکەوتووە.

سەرچاوەی سەرهەڵدانی هۆکاری دووهەمیش:

دەرکەوتنی لە ڕادە بەدەری "دڵ"ە، کـە بـەهۆی کاریگـەریی عیشـقەوە بـە جۆرێکی دەراسا و لە سنوور بەدەر بڵاوی و فراوانی بەدەست هێناوە.

کەچی ئەو پلە هەرە بەرزەی "تەوحید" کە ئـەولیا هـەرە مەزنـەکان، واتـە: ئـەصفیاکانی پلــەی "بێـداری" و مــیراتگرانی مــیراتی پێغەمبەرایــەتی، لــە ڕاشکاویی قورئـانی پیرۆزدا دەیبینـن، پلەیـەکی گەلــێ بـەرزە. چونکـە پلـەی هـەرە مـەزنی: "پەروەردگارێتی" و "بەدیهێنـەرێتی" خواوەنـد دەگەیــەنێت و، گشت ناوە جوانەکانی خـوای گـەورە بـە ڕاستەقینە دەبینێـت و، پارێزگـاریی بناغــەکانی ئیمـــان دەکـــات، بـــێ ئـــەوەی هاوســـەنگیی ئەحکامـــەکانی "پەروەردگارێتی" بشێوێنێت. چونکە ئەوانەی لەم پلەیەدان دەڵێن:

خوای گەورە لە ڕێی ئەحەدیەتی زاتی خۆی و خاوێنیی لە جێ و شوێن و، بە بێ هیچ هۆكارێك، ئاگاداری هەموو شتێكە و، هیچ شتێك لە بازنەی زانینی ئەو بەدەر نی‌یە و، بە زانستی خۆی هەموو شتێكی دەستنیشان كردووە و، بە ویستی خۆیشی تەرجیحی داوە و تایبەتمەندی كردووە و، بە توانستەكەشی بەدیی هێناوە و هێشتوویەتیەوە. چونكە خوای گەورە هەروەك چۆن یەك دانە شت بەدی دەهێنێت و ویستی لەسەری دەبێت، بە هەمان جۆر سەرانسەری گەردوونیش بەدی دەهێنێت و كاروباری دەسازێنێت.. هەروەها وەك چۆن بە" ئاسانی" یەك تاقە گوڵ دروست دەكات، بە هەمان ئاسانی بەهاری مەزنیش بەدی دەهێنێت، كەواتە بەدیهێنانی هیچ شتێك ڕێ لە بەدیهێنانی شتانی تر ناگرێت و، ئەو شتانەی كە خواوەند ڕووی بەدیهێنانیان ئاراستە دەكات، لەت لەت و بەش بەش نابن.

كەواتە خوای گەورە (بە ڕاپەڕاندنی كارەكانی و بە توانست و زانستی خۆی) لە هەموو كات و شوێنێكدا ئامادەیە و، هیچ كەرت بوون و دابەش بوونێك لە ڕاپەڕاندنی كارەكانیدا نی‌یە.

لە وتەی شازدەهەم و، مەبەستی دووهەمی هەڵوێستی دووهەمی وتەی سی و دووهەمدا، ئەمەمان ڕوون كردووەتەوە و بە جوانی چەسپاندوومانە.

وا لێرەدا نموونەیەك دەهێنینەوە (چونكە نموونە دەمقاڵێی تێدا ناكرێت) هەرچەندەش ئەم نموونەیە گەلێ ناتەواوە و مەبەستەكە بە تەواوی بە دەستەوە نادات. بۆ ئەوەش دەیهێنینەوە تاكو خوێنەر لە هەندێ جیاوازیی نێوان ئەو دوو مەشرەبە تێبگات:

گریمان "تاوس"ێكی نائاسایی بێ وێنە هەبێت، كە تابلێی گەورە و لەوپەڕی ڕازاوەییدا بێت و، بتوانێت لە ماوەی چاوتروو كاندنێكدا لە

خۆرهه‌ڵاته‌وه بۆ خۆرئاوا بفڕێت و له یه‌ك چركه‌دا باڵه‌كانی له باكووره‌وه بۆ باشوور بكاته‌وه و دایشیان بخاته‌وه و، سه‌دان هه‌زار نه‌خش و نیگاری ناوازه‌ی له‌سه‌ر نه‌خشابێت، به ڕاده‌یه‌ك كه هه‌موو یه‌كێك له "په‌ڕ"ی باڵه‌كانی به‌وپه‌ڕی جوانی ناوازه‌یی داهێنان و ورده‌كاریی تێدا كرابێت.

ئنجا با ئێستا وا دابنێین كه دوو كه‌س هه‌ن سه‌یری ئه‌م تاووسه ناوازه‌یه ده‌كه‌ن و، ده‌یانه‌وێت به هه‌ردوو باڵی: "دڵ" و "ژیری" به‌ره‌و پله به‌رزه‌كانی ئه‌م باڵنده‌یه بفڕن و بگه‌نه ئاستی ئارایشته نائاسایی و له ڕاده به‌ده‌ره‌كه‌ی.

یه‌كه‌میان: سه‌رنجی تێڕامانی خۆی ئاراسته‌ی بارودۆخ و قه‌ڵافه‌ت و نه‌خش و نیگاره‌كانی قودره‌تی ده‌راسای سه‌ر یه‌ك به یه‌كی "په‌ڕ"ه‌كانی ئه‌و تاووسه كرد و، لێره‌وه نوقمی عیشق و تاسه‌مه‌ندی و خۆشه‌ویستیی ئه‌م باڵنده‌یه بوو. ئیتر به‌كارهێنانی "ژیری" و بیركردنه‌وه‌ی قووڵی خسته لاوه و، ده‌ستی به عیشقه‌وه گرت. به‌ڵام سه‌رنجی دا كه: ئه‌و نه‌خش و نیگاره خۆشه‌ویستانه وه‌ك خۆیان نامێننه‌وه، به‌ڵكو ڕۆژ له دوای ڕۆژ گۆڕانیان به‌سه‌ردا دێت و، ئه‌و خۆشه‌ویستانه‌ی كه ئه‌وین و خۆشه‌ویستیی خۆی ئاراسته كردبوون، هه‌موو ڕۆژێك ده‌ڕۆن و ئاوا ده‌بن!

جا له كاتێكدا كه ده‌بوو بیوتایه: ئه‌م نه‌خشونیگاره وردانه جێ ده‌ستی نیگاركێشێكی ئه‌وتۆن كه خاوه‌نی پله‌ی "به‌دیهێنه‌رێتیی هه‌مه‌كی"یه و، دارای "ته‌نیایی"یه له زاتی خۆیدا و، له توێی "وه‌حدانییه‌ت"ه ڕاسته‌قینه‌كه‌شیدا "په‌روه‌دگارێتی"یه‌كی ڕه‌های هه‌یه.. كه‌چی نه‌یتوانی په‌ی به‌مانه ببات و هه‌ستیان پێ بكات و، دڵی خۆی به‌وه دایه‌وه كه ده‌یوت:

"ڕۆحی ئه‌م تاووسه هێنده به‌رز و بڵنده كه به‌دیهێنه‌ره‌كه‌ی له‌ناو خۆیدایه!.. یان خۆی بووه به خودی به‌دیهێنه‌ره‌كه‌ی! هه‌روه‌ها ئه‌و ڕۆحه

لەگەڵ جەستەکەیدا بووە بە یەك و، لەبەر ئەوەش کە جەستەکەی لەگەڵ ڕوخسارە ڕواڵەتی‌یەکەیدا یەکیان گرتووە، ئەوا تەنها کەماڵی ئەو ڕۆحە و بەرزیی ئەو جەستەیەن کە بەم شێوە ناوازەیە ئەو درەوشانەوانە دەردەخەن. بە ڕادەیەك کە لە هەموو خولەکێکدا نەخشێکی نوێ و جوانی‌یەکی تازەوەبوو پێش‌چاو دەخەن. کەواتە ئەم بەدیهێنانە نوێ‌یانە بە ئیختیارێکی ڕاستەقینە ڕوو نادەن، بەڵکو دەرکەوتن(جلوة) و خۆدەرخستن(تظاهر)ن.

بەڵام کەسی دووهەم، دەیوت:

(ئەم نەخش و نیگارە هاوسەنگ و ورد و ڕێکە، بە دڵنیایی، داخوازی ئەوەیە کە: ویست و ئیختیار و ئامانجێکی تێدا بێت و، هەرگیز ناگونجێ ئەمانە "دەرکەوتن" و "خۆدەرخستن" بن. چونکە هیچ درەوشانەوە و دەرکەوتنێك بە بێ ویست و ئیختیار پەیدا نابن).

بەڵێ، "ماهییەت"ی ئەو تاووسە گەلێ قەشەنگ و جوانە، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز ئەو ماهییەتە "بکەر" نی‌یە، بەڵکو "کارتێکراو"ە و، ناگونجێ لەگەڵ بکەرەکەیدا یەك بگرن.. "ڕۆح"ەکەشی گەلێ بەرزە، بەڵام هەرگیز "بەدیهێنەر" و "دەستێوەردەر" نی‌یە، بەڵکو لە "دەرخەر" و "خولگە" بەولاوە هیچی تر نی‌یە. چونکە هێندە وردەکاری لە هەموو "پەڕ"ێکی جەستەیدا هەیە کە تەنها بە "دانست" ئەنجام دراوە و، هێندەش ئارایشتی تێدایە کە بە "توانست"ێکی ڕەها ڕازاوەتەوە. دیارە هەرگیز ناگونجێ کە ئەمانە بە بێ "ویست" و "ئیختیار" ئەنجام بدرێن.

جا ئەم بەدیهاتووە ناوازانەش کە: ئەوپەڕی "دانست" لە ناوەندی کەماڵی "توانست" و.. کەماڵی "میهرەبانی" و "پەروەردگاریتی" لە نێوان کەماڵی "ئیختیار"دا دەردەخەن.. هەرگیز ناکرێ ئەنجامی: دەرکەوتن(جلوة) و هاووێنەی ئەو بن..

چونكه ئه‌و نووسه‌ره‌ی كه ئه‌م تۆماره زێڕینه‌ی نووسیوه، هه‌رگیز ناكرێ خودی تۆماره‌كه بێت! هه‌روه‌ها ناشگونجێ له‌ودا یه‌كیان گرتبێت! ئه‌و تۆماره ته‌نها هێنده پەیوه‌ندیی به نووسه‌ره‌كه‌یه‌وه هه‌یه كه نووكی قه‌ڵه‌مه‌كه‌ی ئه‌وی به‌ركه‌وتووه!!

له‌به‌ر ئه‌وه، ئارایشتی جوانیی ئه‌و تاووسه - كه مه‌به‌ست پێی بوونه‌وه‌رانه - جگه له‌وه‌ی كه نامه‌یه‌كه و له لایه‌ن قه‌ڵه‌می نووسه‌ره‌كه‌یه‌وه هاتووه، هیچی تر نی‌یه.

وا ئێستا سه‌رنج له تاووسی بوونه‌وه‌ران بده و، ئه‌و نامه‌یه بخوێنه‌ره‌وه و، به نووسه‌ره‌كه‌ی بڵێ:

ماشاءَ اللّٰه.. تبارکَ اللّٰه.. سبحانَ اللّٰه..

خۆ ئه‌و كه‌سه‌ی له‌و گومانه‌دایه كه: نامه‌كه خودی نووسه‌ره‌كه بێت.. یان به ئه‌ندێشه‌ی خۆی پێی وابێت نووسه‌ره‌كه له‌ناو نامه‌كه‌دایه.. یان له‌و وه‌همه‌دا بێت كه نامه‌كه ئه‌ندێشه‌یه و وجودی نی‌یه.. بێ گومان ئه‌و كه‌سه، به په‌رده‌ی "عیشق" ژیریی خۆی داپۆشیوه و، وێنه‌ی ڕاسته‌قینه‌ی "حه‌قیقه‌ت"ی نه‌دیوه.

گرنگترینی ڕووه‌كانی ئه‌و جۆرانه‌ی "عیشق" كه ده‌بنه هۆی ئه‌وه‌ی مرۆڤ مه‌شره‌بی "وحدة الوجود" په‌سه‌ند بكات، بریتی‌یه له: "عیشقی دنیا"! چونكه هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی عیشقی دنیا - كه مه‌جازی‌یه - ده‌گۆڕێت به عیشقی حه‌قیقی، یه‌كسه‌ر ده‌بێت به: "وحدة الوجود".

گه‌ر كه‌سێك كه‌سێكی تری به عیشقی مه‌جازی خۆش ویست، هه‌ر هێنده‌ی "نه‌مان"ی خۆشه‌ویسته‌كه‌ی ده‌بینێت، ناتوانێت ئه‌و "نه‌مان"ه له دڵی خۆیدا جێ بكاته‌وه، بۆیه خۆشویستنی حه‌قیقی ئاراسته‌ی خۆشه‌ویسته‌كه‌ی

دەکات و دەست لە داوێنی حەقیقەتێك گیر دەکات تاکو دڵی خۆی پێ بداتەوە و، دەچێ بە عیشقێکی حەقیقی سیفەتی "مانەوە" بە خۆشەویستەکەی دەبەخشێت و، دەڵێت:

خۆشەویستەکەم ئاوێنەی جوانیی "خۆشەویست" و "پەرستراو"ی ڕاستەقینەیە!

ئەو کەسەش کە ئەم دنیا مەزنەی خۆش دەوێت و سەرانسەری گەردوونی کردووە بە مەعشووقی خۆی، بە هەمان جۆرە، چونکە هەرکات قامچیی "نەمان" و شووڵی "جودایی" لە خۆشەویستەکەی دەسرەوێنرێت، یەکسەر خۆشویستنە مەجازی‌یەکەی دەگۆڕێت بە حەقیقی و، ئیتر ئەو شەیدایە - لە ناچاریدا - پەنا دەباتە بەر "وحدة الوجود" تاکو خۆشەویستە مەزنەکەی لە "نەمان" و "جودایی" ڕزگار بکات!

جا ئەگەر ئەو کەسە خاوەنی ئیمانێکی بەرزی ڕەگ داکوتاو بێت، ئەوا ئەم مەشرەبەی بۆ دەبێت بە پلەیەکی بلندی نوورانی و بەنرخ و مەقبووڵ، وەك ئەوەی "ئیبن عەرەبی" و هاوچەشنی.. دەنا لەوانەیە بکەوێتە نێوان چەندەها گرفتی زۆر و، نوقمی "ماددیات" و "هۆکارەکان" ببێت!

بەڵام "وحدة الشهود" زیانی تێدا نی‌یە و، مەشرەبێکی بەرزی ئەهلی بێداری‌یە.

اللهم أرنا الحق حقا وارزقنا اتباعه.

﴿سُبْحَانَكَ لاعِلْمَ لَنَا إِلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

* * *

## سەعیدی نوورسی کێیە؟

✿ گەورەترین کەسایەتیی کوردی ئەم سەردەمە و، مەزنترین زانایە کە لە دوای (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) لەناو نەتەوەی کورددا هاتووەتە دنیاوە.

✿ لە گوندی (نوورس)ی سەر بە پارێزگای (بەدلیس)ی کوردستانی ژێر دەستەلاتی عوسمانی لە دایك بووە و، لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.

✿ تەنها کەسایەتیی ئەو ڕۆژگارە بووە کە هەموو زەبر و زەنگێکی ڕژێمی مستەفا کەمال و، دام و دەزگا چەوسێنەرەکانی و، سی و پێنج ساڵی بەندی و زیندانی تاکە کەسی و نەفی و دەست بەسەری و، دەیان دادگای تۆقێنەر نەیانتوانیوە چۆکی پێ دابدەن و لە خەباتی ڕەوای خۆی کۆڵی پێ بدەن. تەنانەت ئەو توانیویەتی سەرکەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.

✿ زیاتر لە سەد و سی کتێب و پەیامی پێشکەشی هەموو گەلان و نەتەوەکانی سەر ڕووی زەوی کردووە و، بە زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان - کە یەکێکیان زمانی کوردیـیە - بڵاو بوونەتەوە.

✿ تا ئێستا زیاتر لە پازدە کۆنگرەی جیهانی و، دەیان سیمینار و کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا بۆ گیراوە و، دەیان کتێب و سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە.

# پێڕستی بابەتەکان

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|




خوێنه‌ری به‌ڕێزم !

ئه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت چه‌ند ده‌ستوورێك بزانیت سه‌باره‌ت به‌:

- نزیكترین ڕێ بۆ لای خوای گه‌وره‌.
- ویلایه‌تی هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان.
- ڕێبازه‌كانی ناسینی خوای گه‌وره‌ و، ڕێگاكانی ویلایه‌ت.
- ناوه‌نده‌ ڕێباز بۆ هه‌ڵسه‌نگاندنی جیاوازیی نێوان ئه‌ولیاكان.
- زیان و ناته‌واوییه‌كانی "وحده الوجود".
- میانه‌ڕه‌وی له‌ باسی ئه‌و پیاوچاكانه‌ی بۆچوونی جیاواز هه‌ڵده‌گرن.
- كلیله‌كانی سه‌یروسلووك و.. گرفته‌كانی ڕێ و.. به‌روبوومه‌كانی.
- (په‌یامه‌كانی نوور) و ڕۆڵی (مورشید).

ئه‌گه‌ر حه‌زت له‌ زانینی ئه‌م چه‌شنه‌ ده‌ستوورانه‌ هه‌یه‌،
ئه‌وا فه‌رموو به‌ وردی ئه‌م كتێبه‌ بخوێنه‌ره‌وه‌.




---

نرخی ( ٣٥٠٠ ) دیناره‌